# چاوگی بی‌وانا لە زمانی کوردیدا
# هوو چونیەتی بەکارهینانی
# لەم زمانەدا


دانەری

دوکتۆر نەسرین فەخری

مامۆستای زمانو رێزمانی کوردی

لە دانشگای بەغداو

ئەندامی یاریدەری کۆری زانیاری‌ی کورد



بەغـــدا

١٣٩٣ ك — ١٩٧٣ ز





بە یاریدەی کۆری زانیاری‌ی کورد

لە چاپ دراوە

# چاوگی بێ‌واتا لە زمانی کوردی‌دا
# هوو چونیەتی بەکارهێنیانی
# لەم زمانەدا

دانەری

دوکتۆر نەسرین فەخری

مامۆستای زمان‌و ڕێزمانی کوردی

لە دانشگای بەغداو

ئەندامی یاریدەری کۆری زانیاری‌ی کورد

بەغـــدا

١٣٩٣ ك — ١٩٧٣ ز



بە یاریدەی کۆری زانیاری‌ی کورد

لە چاپ دراوە

مطبعة الآداب في النجف الأشرف

# پێشەکی

دەتوانین بڵێین کە ئەم باسەی لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە بەشێکی ئەو باسەیە کە چەند ساڵەخەریکین کۆی دەکەینەوەو لێی دەکۆڵینەوە بەگوێردی تواناو ساڵ بە ساڵیش بەرهەمی ئەم رەنجە دەخەینە پێش چاوی قوتابیانی بەشی زمانی کوردی، تاوەکو سەرنجی هەندێکی بەجۆرێك راکێشا لەو پرسیارانەدا دەردەکەوت کە هەمیشە لێمان دەکران، تا گەیشتە رادەی کۆبوونەوەی لە تکاو پرسیارێکی دڵسۆزانەدا بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم باسە بەتایبەتی پاش بڵاوبوونەوەی ووتارێك بەناونیشانی «چاوکی کوێرەوەبوو لە زمانی کوردیدا» لەلایەن «بەهزاد» ناوێکەوە لە کۆڤاری: بەیان.. ژمارە:٢ ساڵی = ١٩٧٢.

هەرچەندە چەند مانگێك دواکەوتین لە بڵاوکردنەوەیدا لەبەر هەندێك هۆی لە توانا بەدەر، بەڵام هەر وەك پەندێکی رووسی دەڵێت: «دواکەوتن لە نەبوون باشترە»ـ بڵاوی دەکەینەوەو پێشکەشی دەکەین، بەوانەی خولیای راستین و دەیانەوێت لە چوارچێوەی زماندا کە ئاوێنەی راستەقینەی بێ گەردی نەتەوەو رابوردووی گەلەو ئەو تیشکە بەهێزەیە کە هەمیشە رێگەی ئەمڕۆو دوا رۆژمان بۆ روونەدەکاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا داوای

لێبوردن دەکەین لە خوێنەری بەرێز لە کەموکووری و ناتەواوی باسەکە کە بەراستی زۆر لەمە زیاتر هەڵدەگرێت کە خۆمانمان لێ لاداوە، بۆ چاپی دووەم بەهیوای رەخنەی بەجێی شارەزایانی زمان و ئەوانەی پەیوەندییان هەیە، یان هۆگری ئەم جۆرە باسانەن :

* * *

# « چاوگی بی واتا لە زمـانی کوردیدا »
# یان ـ «ئەو چاوگانەی بەتەنیا بەکارنایێن »
# «هوو جوری بەکارهینانیان لەم زمانەدا»

لێرەدا ناماناەوێت دوورودرێژ باسی چاوگ بکەین بۆیە یەکسەر لەو شوێنەوە دەست پێدەکەین کە پەیوەندیی بـــە باسەکەمانەوە هەیە ـ ئەویش ئەو چاوگانەن کە بەتەنیا بەکارنایێن یان وادێنە بەرچاو، چونکە نەواتاو، نەمەبەستی تەواو نادەن بەدەستەوە بەروونی .

ئەوەی ئاشکرایە زمان وەك هەموو کیان لەبەرێك لە زاوزێو پێشکەوتنو پەرەسەندندایە، ووشەی زمانیش بەم جۆرە، بۆیە هەیە ئێستا واتای نەماوەو بەکارنایێت، یان بێواتا دێتە بەر چاو، لەم باسەدا هەندێك لەو چاوگانە دەهێنینەوە کە بە بەرگێکی نوێو دەورێکی تازە دێنەوەکۆری زمانـ و دەیەها کەلێنو بۆشایی ئەم زمانە پڕ دەکەنەوە کە ئەنجامی پەرەسەندنو بەرەوپێشەوەچوونی زمانە شانبەشانی پێشکەوتنو پێویستەکانی کۆمەڵ، وەك زمانە زیندووەکانی جیهان، سەرەرای دەرخستنی سەربەخۆیی ئەم زمانە لە تایبەتیەکانیدا، لەگەڵ

بەستنەوەی بە زمانەکانی هەمان بنەماڵەی ئەم زمانە لە تایبەتیە هاوبەشیەکاندا، لەگەڵ گەلێك بەڵگەی تریش کە لە باسەکەدا بەدیاردەکەوێت ولە ئەنجامیش دا بە پوختی و کۆکراوەیی دەخرێتەوە پێش چاو .

* * *

ئەو چاوگانەی بە پیتی « ئا » دەست پێ دەکەن :

١ ـ ئالان(١) : پێچ خواردنی دوو شت بەیەکدا : تێنەپەرە .

ئالاندن : بادانی دوو شت بەیەکدا.. تێنەر(٢) .

تێك ئالان : لوول خواردنی دوو شت یان زیاتر .

لێك ئالان : بە واتای تێك ئالان ـ واتە ئالۆزکان .

تێ ئالان<br>لێ ئالان : هەردووکیان بە هەمان واتای تێك ئالان و لێ ئالانن .

ئاڵ : رەگی چاوگ .

ئاڵ(٣) : ناوە بۆ رەنگی سووری کاڵ .

ئالان : رەگی چاوگی « ئالاندن » .

ئالان(٤) : ناوی کۆیە بۆ ئاڵ

ئالا : بناغەی چاوگی « ئالان » .

ئالا(٥) : ناوە بە واتای بەیداخ « عَلَمْ » .

ئەو چاوگانەی بە پیتی « ب » دەست پێ دەکەن :

٢ ـ بڕکان : چاوگێکی ئەلفیی(٦) تێنەپەری بێ واتایە، مەبەست لە بێ واتایی، بەکارنەهێنانی چاوگەکەیە بە تەنیا،

چونکە هیچ مەبەستێکی واناگەیەنێت، بۆ باشگر یان پێشگر(٧) .

بڕکانەوە : چاوگێکی ئەلفی ی تێنەپەری واتادارە، بەواتای تێکچوون و گۆڕرانی شیر(٨) .

هەڵبڕکان : چاوگێکی ئەلفی ی تێنەپەری واتادارە ، دووبارە بەواتای ـ بڕکانەوە . واتە هەردووکیان هاومەبەستی یەکن و بەواتای هەڵبزرکان دێن .

بڕك : رەگی چاوگی بڕکانە(٩) .

بڕك : ناوە، ناوی ژانێکە لە پشت و کەلەکەدا پەیدادەبێت بەهۆی سەرمابوونەوە(١٠) .

بڕك . بڕکە : پەل . بڕکێکی تێ کرت(١١) .

بڕك کردن : چاوگێکی لێکدراوە پێکهاتووە لە : ـ

بڕك « ناو و رەگی چاوگ » + کردن + فرمانی یارمەتی دەر بەواتای دووچاربوونی ئازاری بڕك :

بڕك‌دان : بەواتای فڕێدان(١٢) .

٣ ـ بزرکان(١٣) : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری بێ‌واتا .

هەڵبزرکان : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری واتادار بـــەواتای تێکچوون و گۆڕرانی شیر . وەك :

بڕکانەوەو هەڵبڕکان .

٤ ـ بڕسکان : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری بێ‌واتا

هەڵبڕسکان : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری واتادار بەواتای

هەڵبزرکان. « برسکان و بزرکان » یەکن(١٤) .

٥ ـ بووران : چاوگی ئەلفی‌ی تێنەپەری بێ‌واتا .

بوورانەوە(١٥) : چاوگی ئەلفی‌ی تێنەپەری واتادار بەواتای لەخۆچوون، لەهۆش‌چوون

٦ ـ بێژان : چاوگی ئەلفی‌ی تێنەری بێ‌واتا(١٦) .

بێژانەوە : چاوگی ئەلفی‌ی تێنەری واتادار، بەواتای پاك‌كردنەوەو جوداكردنەوەی شتێك لە پیسی و شتی زیادە . بۆنموونە « گەنمەكەم بێژایەوە » .

دابێژان : بەهەمان واتای بێژانەوە

بێژ : رەگی چاوگی « بێژان و » « بێژین »ە(١٧) .

بێژنگ(١٨) : پێك‌هاتووە لە رەگی چاوگ. بێژ + پاشگری « نگ » بێژنگ ناوە بۆ ئەو شتەی كاری بێژانەوەی پێ جێ‌بەجێ‌دەكرێت .

٧ ـ بووژان چاوگی ئەلفی‌ی تێنەپەری بێ‌واتا .

بووژانەوە : چاوگی ئەلفی‌ی تێنەپەری واتادار، بەواتای ژیانەوەو هاتنەوە سەرخۆ .

بووژ : رەگی چاوگە .

بووژاندنەوە : چاوگی دالی‌ی تێنەری واتادار ، بەواتای ژیاندنەوەو هێنانەسەرخۆ. پێك‌هاتووە لە : رەگی‌چاوگ « بووژ » + پاشگری « ئاندن »(١٩) + پیتی پەیوەندی « ە » + پاشگری « وە » .

٨ ـ بەشین(٢٠) : چاوگی یانی بە بێ واتاو تێنەرە .

بەشینەوە : چاوگی یانی ی تێنەری واتادارە بـــەواتای دابەش کردن

بەش : رەگی چاوگ .

بەش(٢١) : ناوە، بەواتای نەختێك ، هەندێك ، . .هتد .

دابەش کردن : بڵاوکرونەوەی شتێك بەسەر چەند کەسێك یان چەند کۆمە لێكدا .

دابەش کردن چاوگی لێکدراوە پێك هاتووە لە پێشکری :ـ دا + بەش . ناوو ، رەگی چاوگەکـــە + فرمانی یارمەتی دەر : ـ کردن .

بەش کردن : چاوگی لێکدراوی پێك هاتوو لە رەگی چاوگ و ناوی بەش + فرمانی یارمەتی دەر

٩ ـ بریسکان : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری بێ واتا

بریسکانەوە : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری واتادار بەواتای شەوق دانەوە :

بریسك : رەگی چاوگ .

بریسکە(٢٢) : ناوە ـ بەواتای بریقە، لەوانەیە هەر بریسك + پاشکری «ە» بێت .

١٠ ـ بریقان : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری بەتەنیا بەکارنەهاتوو

بریقانەوە : چاوگی ئەلفی ی تێنەپەری واتادار ، بەواتای ، بریسکانەوە .

بریقاندنەوە : بەهەمان واتا ، بەلاّم تێپەڕەو چاوگێکی
«دالی» یە بەیاریدەی پاشگری «ئاندن» بووە
بە تێپەڕ .
بریقان : رەگی چاوگی «بریقاندن» ەو چاوگی تێنەپەڕە .
بریق(۲۳) : رەگی چاوگی «بریقان» ـە .
بریقەبریق : چوونەناوە ، بۆ هەمان مەبەست .
ئەو چاوگانەی بەپیتی «پ» دەست پێدەکەن .
۱۱ ـ پرووزان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی بەتەنیا بەکار ـ
نەهاتوو .
هەلْپرووزان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی واتادار ، بەواتای
تێك چوونی شت ئەنجامی گەرماو نیزیك بوونەوە
لەئاگرو کری ئاگر .
هەلْپروزاندن : چاوگی دالیی تێپەڕ ـ بۆ هەمان مەبەست
شت کردن بە ئاگردا بەتایبەتی ـ خوریو موو
لەگەلْ هەرشتێك لەم بابەتە بێت
پرووزان : رەگی پرووزاندن .
پرووز : رەگی چاوگی ـ پرووزان .
۱۲ ـ پرووکان : چاگی ئەلفیی تێنەپەڕی بەتەنیا بەکارنەهاتوو
هەلْپرووکان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی واتادار . دووبارە
وەك : پرووزان (هەلْپرووزان) بەواتای تێك چوون
بەگەرما ، یان کر لە مرۆڤ بوونەوەو لەشت ،

ئەنجامی گەرمی و گەرمایەکی زۆر . بۆنموونە :-
لە گەرمان دا هەڵپرووکام . دەشکوترێت ، لەگەرمان دا
پرووکام(٢٤) .
١٣ - پرووسکان : چاوگی ئەلفی تێنەری بێ واتا . یان بەتەنیا
بەکارنەهاتوو . دەگوترێت - پروسقان - یان -
پرووسکان .
هەڵپرووسقان : چاوگی ئەلفی تێنەری واتادار ، بەواتای
داروونان و قۆستنەوە .
داپرووسقان : یان داپرووسکان. بەهەمان واتا، هەڵپرووسکان و
داپرووسکان هاومەبەستن .
پرووسق : پرووسك(٢٥) . رەگی چاوك .
١٤ - پۆشین(٢٦) : شاردنەوە .
داپۆشین : چاوگی یائی ی تێپەر .
خۆداپۆشین : بۆهەمان واتا هاتۆوە .
چاولێ پۆشین(٢٧) : بەواتای لێبوردن ، چاوپۆشین و
شاردنەوەی هەڵەی بەرانبەر .
پۆشی : بناغەی چاوگ(٢٨) .
پۆش : رەگی چاوگ ، هەروەها ناوە بۆ جۆرە رەنگێك
ئەرەشە ئەبۆر .
رووپوش : ناوی لێکدراوی پێکهاتوو لە ، روو ( ناو ) +
پۆش رەگی چاوگ ، بەواتای پێچە . یان پەچە

بالاپۆش : ناوی لێکدراوی پێکهاتوو له بالا ( ناو ) + پۆش به واتای ( عه‌با ) .

ره‌ش‌پۆش به‌واتای ( سیاه‌پوش ) .

پۆشته‌(۲۹) : ناوی فرمانه پێك‌هاتووه - له پۆش (ره‌گ) + پاشگری ( ته ) . خۆی پۆشته کردەوه . بۆنموونه:

گوڵ چۆن رووی تازیز نه‌زاکه‌ت پۆشان

وه‌فراوان چۆن سه‌یل دیده‌ی من جۆشان .

۱۵ - پۆقین : چاوگی پانیی تێنه‌په‌ری بێواتایه .

دەرپۆقین : چاوگی لێکدراوی پێکهاتووه له ناوو ئاوه‌ڵکاری (ده‌ر) + چاوگی (پۆقین) به‌واتای هاتنه‌ده‌ره‌وه یان ده‌رپه‌رینه‌ده‌ره‌وه .

پۆق : ره‌گی چاوگ .

ریپۆق : ری + پۆق = ریپۆق - ناوی لێکدراوه به‌واتای، ئه‌وپیسایی‌یه دێت که له ده‌وروپشتی چاو ده‌بێت ئه‌نجامی پیسی یان چاوێشان: واته : پیسایی چاو

۱۶ - پلۆخان : چاوگی ئه‌لفیی تێنه‌په‌ری بێواتایه .

داپلۆخان : چاوگی ئه‌لفیی تێنه‌په‌ری واتادار ، به‌یاریده‌ی پێشگری ( دا ) و به‌واتای : بریندارییو داڕزینی شوێنێك، به‌گشتی ئه‌نجامی سووتانو داماڵین به‌هۆی ئاگر یان ئاوی کوڵاوکوڵ بۆنموونه :

ناو ده‌می منداڵه‌که داپلۆخاوه .

پلۆخ(٣٠) : ڕەگی چاوگ .

١٧ ـ پلۆسین : پلۆسین چاوگی ( یائی ) تێپەڕی بێواتا .

پلۆستن : پلۆستن و پلۆسین یەکن تەنیا ئەوەندە هەیە نیشانەی چاوگە کانیان جودایە .

داپلۆسین : چاوگی یائیی تێنەپەڕی واتادار ، بەواتای داگرتن و لێدان . وەك : منداڵەکەی داپلۆسی ، یان داپلۆست . تونە لێی دا ، داگرتنی یەکێك بەلێدان یەك لەسەر یەك .

پلۆس : ڕەگی چاوگ .

١٨ ـ پیشان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی بێواتا .

پیشانەوە : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی واتادار ، بەواتای دارزان و فلیقانەوە ئەنجامی بەسەریەکدا کەوتن و قورسایی کەوتنەسەر .

پیشاندنەوە : چاوگی دالیی تێنەپەڕی واتادار . بەواتای تێکدان و فلیقاندنەوە بەقورسایی خستنەسەر .

پلیش : ڕەگی چاوگی ـ پلیشان .

١٩ ـ پاڕان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی بێواتا .

پاڕانەوە : چاوگی ئەلفیی واتادار ، بەواتای ، تکاکردن لەیەکێك ، لاڵانەوە بەرانبەر بەیەکێك . ( ئاندن وەرناگرێت ) .

پاڕ : ڕەگی چاوگ .

٢٠ - پاچین : چاوگی پائی تێپەری بێواتا .

هەڵپاچین(٣١) : چاوگی پائی‌ی تێپەری واتادار ، بەواتای بڕینەوەی دارو تەنیا هێشتنەوەی بنەکەی ، دەشکوترێت : سەرهەڵپاچینو تووك هەڵپاچین بەهەمان واتا .

داپاچین : بەواتای لێدان ( مجاز ) - دای پاچی .

پاچ : رەگی چاوگ .

پاچ : ناوە بۆ جۆرە ئالەتێك بێستانی پێ پاچەکۆڵە دەکرێت ، ئاسنێکە زەوی‌ی پێ بژار دەکرێت .

پاچەکۆڵە : ئاسنێکە زەوی‌ی پێ بژاردەکرێت .

پاچەکۆڵەکردن : چاوگی لێکدراوە بە واتای پاك کردنەوەی درکو دەغەڵی بێستان .

پاچینە(٣٢) : پاچ + ی ( پێق پەیوەند ) + پاشکری (نە) بەواتای ( پەلیکانێ یان پاچ پاچێن ) کەناوی جۆرە پاری یەکە .

پاچکاری : پاچ ( ناوو رەگی چاکێ ) + کار ( ناو ) = ئیش کردن بە پاچ :

تەورپاچ : ناوی لێکدراوە . بۆ ئەو شتەی کە کۆترەی داری پێ دەردەکرێت .

پاچوولکە(٣٣) : پاچ + وو + لکە = پاچوولکە . ناوی بچووککراوە بەواتای پاچی بچووك ،

٢١ ـ پلۆسكان : چاوگی ئەلفیی تێپەرە ، بێواتایە .
داپلۆسكان : چاوگی ئەلفیی تێپەری واتادارە ، بەواتای
داروو تان و پاككردنەوە . قۆستنەوە ، رووتاندنەوە
پلۆسك(٣٤) : رەگی چاوگ .
٢٢ ـ پسكان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەری بێواتا .
راپسكان : دووبارە چاوگی ئەلفیی تێنەپەری بێواتا .
راپسكاندن : چاوگی دالیی تێپەری واتادار ، بــەواتای
راتەكاندن ، راكێشان لە پرو بەتوندی ، فڕاندنی
شتێك لە دەستی یەكێك لەناكاو .
پسكان : رەگی چاوگی پسكاندن و چاوگی بێواتای تێنەپەر
پسك(٣٥) : رەگی چاوگی پسكان .
پسك ـ یان ـ پزك ـ بەواتای : قژ ، كەزی .
٢٣ ـ پەستن : چاوگی تائیی تێپەری بەكارنەهاتوو .
پەستنەوە : چاوگی تائیی تێپەری واتادار ، بەواتای پڕكردنی
شتێك بە زۆر .
پەست : بناغەی چاوگ .
پەست . ناوە بە واتای توورەبوون كە واتای پڕبوون
دەگرێتەوە دووبارە .
پەس(٣٦) : رەگی چاوگ .
پرخان : چاوگی تێنەپەری بێواتا .
پرخاندن : چاوگی دالیی تێنەپەری واتادار .

پرخەپرخ : ناوی دەنگێکە کە لە لووت دێتە دەرەوە کاتی
نوستن ئەنجامی لووت گیران . ئەم چاوگە لـــە
ناوی دەنگەکەوە دروستبووە .

پرژان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی بێ واتا .

پرژاندن : چاوگی تێپەڕی دالیی واتاوار ، بەواتای
بڵاوکردنەوە ، رژاندن وورد ووردو لەسەرخۆ .

پرژان : رەگی چاوگی ( پرژاندن ) وچاوگە تێنەپەرەکەیەتی

پرژ : رەگی چاوگی ( پرژان ) ـە . پرش وپرژ لەوانەیە
یەك (٣٧) بن .

٢٥ ـ پروان : چاوگی ئەلفیی بێ واتا .

هەڵپروان : چاوگی بێ واتا ، چونکە وەك تێنەپەر
بەکارنایەت .

هەڵپرواندن (٣٨) : چاوگی دالیی تێپـــەر ، بەیاریدەی
پاشگری ( ئاندن ) و واتاوار بەیاریدەی ـ پێشگری
( هەڵ ) بەواتای دانە دانە کردن و لەیەك ـ
جوداکرونەوە ، بەتایبەتی بۆ ـ هەنارو ترێ و
شتی تر کە وەك ئەمانە وابن .

ئەو چاوگانەی بەپیتی ( ت ) دەست پێدەکەن .

٢٦ ـ تەکین : چاوگی یائیی تێنەپەری بێ واتا .

تەکینەوە : چاوگی یائیی تێنەپەری واتادار ، بەواتای
گەرانەوەو دوور کەوتنەوە .

تەك : ڕەگی چاوگە .

تەك (٣٩) : ئاوەڵكارە ( ظرف ) بەواتای تەنیشت ، كن
لا ، نك ، پاڵ ، دایە تەك خۆی : دایە پاڵ
خۆی .

تەكان (٤٠) : تەك + پاشكری ( ئاندن ) = تەكان ناوی
فرمانی چاوگی ( تەكین ) ـە . تەكانی دایە خۆی
لە پڕ هەڵستا گوڕی وایە خۆی .

ڕاتەكین : بەواتای داچڵەكین ـ ترسـان ، خورپە لە
دڵەوە هاتن ، دڵم ڕاتەكی ە

داتەكین : بەواتای نابووت بوونی مەردووم ، داتەكیم . .
هیچم بەدەستەوە نەما ، پیربوونو باڵاڵا چوونی
گیاندار ، چۆڵبوونو بۆشبوونی شت بەجۆرێك
كە هیچی تێدانەمێنێت داتەكینو داتەكیان ،
ڕاتەكینو ڕاتەكیان ، یەكە . داتەكیان ـ سەربەرەو
خواركرونەوەی شت بەجۆرێك هیچی تێـــدا
نەمێنێت .

٢٧ ـ تەكان :

تەكاندن : چاوگی دالی تێپەڕی واتادار ، بەواتای
ڕاوەشاندن كاتی پاككرونەوەی شت .

هەڵتەكاندن : بەواتای ڕاوەشاندن بۆسەرەوە .

داتەكاندن : بەواتای ڕاوەشـاندن و جووڵانەوە بەرەو

خوارەوە .

راتەکاندن : بەواتای راوەشاندنو راکێشان لە پڕو لە ناکاو .

راتەکان : کورد دەڵێت دڵم راتەکی ( راتەکان ) بە واتای وڵم داچڵەکی .

تەك رەگی چاوکی ( تەکان ) و ( تەکین )ـە و ئاوەڵکاریشە هەڵتەکان ـ چاوکی ئەلفی‌ی واتادار ـ لە بنەدا هەڵتەکا .

هەڵتەك پێشکری هەڵ + ناوو رەگی چاوکی تەك . کورد دەڵێت : هەڵتەك هەڵتەك .

تەکان رەگی چاوکی ( تەکاندن ) و چاوکی بێواتاو ناوی فرمانە ، تەکان دانە خۆ ـ خێرا رۆیشتن .

تەك‌دانەوە چاوکی لێکدراوی پێك‌هاتوو لە : تەك + دان وە . ناوو چاوك و یا مشکری ( وە ) پاڵ‌دانەوە .

دانەبەرتەکان ـ یان ـ بەرتەکان‌دان بەواتای لێدان .

۲۸ ـ تکان

دانکان

لێ‌تکان : لێ‌رژان . مەنجەڵەکە لێ‌ی دەتکێت .

تکاندن رژاندن لە سەر خۆ . یان تێ‌کردن لەسەر خۆ ، بۆنموونە : دەرمانەکە لەسەرخۆ بتکێنە چاوی .

تك (٤١) ناوو رەگی چاوکی ( تکان ) .

تك تك جووتەناو . تك‌تك بەناخی عەرزا چووەمە خوارەوە

تێتکان : تێرژان. قاپێك بجەرە ژێر کووپەکە با تێی بتکێت . تك ـ قەترە ، دلۆپ .

٢٩ ـ تروووکان

تروووکاندن جۆرە جوولەیەکی تایبەتی‌یە بۆ چاو هەروەها بۆ چراو فانۆسیش بەکاردێت . چاوی دەتروووکێنێت .
چراکە تروووکەی لێوە نایێت . یان دەگوترێت چاوی لێ بتروووکێنە . واتە بە چاو ئاگاداری بکەوە .

هەڵتروووکاندن چاوی لێ هەڵدەتروووکێنێت .

٣٠ ـ ترووشکان چاوکی تێنەپەڕی ( ئەلفی ) ی بێ‌وانا .

هەڵترووشکان چاوکی تێنەپەڕی ( ئەلفی ) ی واتادار . جۆرە دانیشتنێکە .

٣١ ـ تووتان : چاوکی ( ئەلفی ) ی تێنە پەڕی بێ‌واتایە .

هەڵتووتان چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنە پەڕی واتاوارە ، بەواتای دانیشتن ، بەڵکو جۆرە دانیشتنێکە بەتایبەتی بۆ سەگ بەکاردێت و هەروەها بۆ مرۆڤیش .

تووت : رەگی چاوگ .

تووت + ـە = تووتە ـ ناوی دەنگە بەکاردێت بۆ دەرکردنی ئاژەڵ .

تووتە ناوی پەنجە بچکۆلەی دەست و پێیە .

تووته : گۆشتێکی زیاده لەسەر پێلووی چاو پەیـــدا
دەبێت (٤٢) .
تووتکە : تووت + پاشگری ( کە ) . سەگی بچووك :
تووتکە سەگ ـ سەگی بچووك لەتەمەندا .
تووتکە : کرمێکە کەسێك کە هاربێت یان هاربووبێت
دای دەنێت . وەك جوێنێش بەکاردێت ـ تووتکەسەگ
تووتك (٤٣) ـ وەك تووتکە ـ سەگی بچووکە .
تووتك ناوی نانی بچووکە لە شێوەی ( ژوورووودا ) .
٣٢ ـ تێزان (٤٤) بەواتای پڕبوونی شوێنێك لەلەش ئەنجامی
برین و پیس بوونی برین ـ وەك : ئاو یان کێم و
پیسایی . بۆ نموونە ـ پەنجە برینداره کەی ئاوساوەو
کێمی تێزاوە ، ئاگادار بە کێمی تێنەزێت ،
ئەگەر ئێستا پەنجەت بات نەکوشیش دووباره
خوێنی تیدە زێتەوە . واتە ـ پڕدەبێتەوە لەخوێن
لێرەدا ـ چاوگەکە ـ زان (٤٥) ە ـ تێ پێشگرە
٣٣ ـ تیزان (٤٦) . چاوگی ئەلفی ی تێنەپەڕی بێ واتا
تیزاندن چاوگی ( دالی ) ی تێنەپەڕی بێ واتا .
هەڵتیزاندن ـ بەواتای راکردن لە پڕو لە ئەنجامی تووڕە بوون
هەڵتیزان ـ ئەسپەکە لەشاخەکە هەڵتیزا ـ بەواتای
کەوتەخوارەوە .
تیز : رەگی چاوگی ( تیزان ) و ( هەڵتیزان ) ە

تیز ناوه بە واتای ـ گاڵتە ـ تیز پێوه کرون ـ گاڵتە پێ کرون

٣٤ ـ تفین

تفینەوه

تفین رەگی چاوگی ( تفینەوه ) و چاوگە .

تف رەگی چاوگی تفینو ناوه

تف کرون : لەیەکێکەوه بۆ یەکێك . تفی لە منداڵەکە کرد بە بێ سووچ

تف کرونەوه ـ فرێدانی شت لەرێی دەمەوه .

٣٥ ـ تووان : چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەری بێ واتا .

تووانەوه : تووانەوه چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەری واتادار ، بەواتای گۆرینی شتێك لەتوندی یەوه بۆ شلی وەك بەفرو رۆن هتد . . .

مژدەبێ ساڵ گەرایەوه

بەفری زمستان توایەوه

توو رەگی چاوگی ( تووان ) و ( تووانەوه ) یە .

تووان رەگی چاوگی ( توانین ) و تواندنەوەو چاوگیشە ،

تواندنەوه ـ تێپەری توانەوەیە .

٣٦ ـ تلان چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەری بێ واتا

تلانەوه : چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەری واتادار ، بەواتای گەرزدان ، خولخواردن ـ وەك : لەعەزرەت ئازار هەر دەتلێتەوه .

تل ڕەگی چاوگ .

تل خواردن ـ چاوگی لێکدراوی دروستبوو لە ڕەگی چاوگی : تل + چاوگی یارمەتیدەری خواردن .

تلدان ـ ڕەت بردن ـ تلێکیدا وەختبوو ملی بشکێت .

تلبوونەوە ـ تل + بوون + وە ـ غلۆربوونەوە .

٣٧ ـ تلیشان : بەتەنیا بەکارنایێت .

هەڵتلیشان ـ جۆرە درینێکە . بۆشت فلیشـانیش دەکرێتەوە شەقەبردنو لێکبوونەوە بەرەو سەرەوە . شتێك لەیەك جودا ببێتەوە یان درز ببات . تێنەپەڕی ( ئەلفی ) یە .

داتلیشان : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەرە ، بەواتای شەق بردن بەرەو سەرەوە پیشان دەوات .

تلیش : ڕەگی چاوگ .

تلیش‌بردن : شەق‌بردن .

٣٨ ـ ترووسکان :

داترووسکان : ( ترسانو واچەنین )ی گیاندار . چاوگێکی تێنەپەڕی ( ئەلفی )یە .

داترووسکاندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕە . ترسـاندن ، داچڵەکاندن ، ڕاپەڕاندن لەناکاو .

ترووسك : ڕەگی چاوگی ـ ترووسکان .

ترووسکە : بەواتای ڕووناکی ، شەوق . تاریکستانێکـە

ترووسکەی لێوەنایێت .

٣٩ ـ تلیسان :

تلیسانەوە : فلیقانەوە ، پلیشانەوە .

چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی واتادارن .

تلیس : رەگی چاوگ .

وریابە گوڵەکان نەتلیسێنیتەوە .

٤٠ ـ تریقین : پێکەنینی لە پڕ ، ( بەتەنیا وەك چاوگ و فرمانێکی سەربەخۆ لەشێوەی ژووروودا بەکاردێت .

تریقانەوە(٤٧) لەگەڵ پاشگری ( وە ) لە شێوەی خوارووداً بەکاردێت ، وەك کەنین و پێکەنین لەم دوو شێوەیەدا

تریق : رەگی چاوگ .

تریق(٤٨) ناوی فرمانەو ناوە بۆ هەمان پێکەنین .

تریقەتریق(٤٩) : جووتە ناوە بۆ هەمان مەبەست و بەردەوامی کارەکە

قاقاوتریقە : جووتە ناون بۆ هەمان مەبەست . تریقایەوە یان دایە قاقای پێکەنین .

٤١ ـ تاران(٥٠) :

تاراندن : چاوگی تێپەڕی ( دالی )ی واتادارە . بەواتای خەوزڕاندن ـ رێ نەدان بە نوستن .

مەرج نیە ئەم چاوگە تێنەپەڕی هەبێت وەك لەسروشتی فرمانەکەوە بۆمان روون دەبێتەوە نموونە

بۆ تاراندن .

کورکەو نیو حیلەی ئالێك دوەاکەوتوو

خــەو ئەتارێنێ لە چـاوی نوستوو

تاران(٥١) : رەگی چاوگی ( تاراندن )ە .

٤٢ - تەوین:

تەواندن : تەو + ئاندن = تەواندن . وەك دەردەکەوێت لە ناوی دەنگەوە وەرگیراوە . چونکە کاتێك کە مرۆڤێك سترانێك - گۆرانی‌یەك - دەبێژێت یەکێکی دیکە لەولاوە دەتەوێنێت - دەڵێت- تەوتەو ، تەواندن = چاوگێکی تێنەپەڕی ( دالی )یە

تەوان : رەگی چاوگی ( تەواندن )ـە .

تەو(٥٢) یان- تەوتەو ناوی دەنگەکەیە .

٤٣ - تەمران(٥٣) :

تەمراندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕە بە واتای ڤەمراندن یان کوژاندنەوەی ئاگر .

تەمران : رەگی چاوگی ( تەمراندن )ە .

تەوچاوگانەی : بە پیتی ( چ ) دەست پێدەکەن .

٤٤ - چەنین :

راچەنین : چاوگی ( یائی )ی تێنەپەڕە بەواتای راچڵەکین و ترسان، داخورپان .

چەن(٥٤) : - رەگی چاوگە .

٤٥ ـ چەمان‌و چەمین :
چەمانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی واتادار .
خوار بوونەوە .
چەمینەوە : چاوگی ( یائی ) تێنەپەر . بۆ هەمان واتا ،
لار بوونەوە .
کۆم بوونەوە بۆپشت .
چەم : رەگی چاوگ .
چەم . ناوی ئاوێکی گەورەیە کە لە چەنە ئاوێك پەیدا
بوو بێت‌و کۆبوو بێتەوە .
چەمین : چەم + ین = چەمین ـ ناوە بەواتای نێوانی دوو برۆ
٤٦ ـ چەکان :
داچەکان : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەری واتادار، بەواتای
سنگی داچەکاوە. کراوەتەوە، بەپێچەوانەی داخستن
چەکین : ـ وەك چەکان .
داچەگین : وەك : داچەکان .
چەك : رەگی چاوگ .
چەك : ناوە ( سلاح )ی عەرەبی دەکرێتەوە .
٤٧ ـ چڵەکین : چاوگی تێنەپەڕی بێ‌واتا .
داچڵەکین : چاوگی تێنەپەڕی ( یائی )ی بە واتای ـ
داترووسکان ، راچڵەکین ، راچەنین ، راپەڕین
کە لەناکاوو جۆرە تەنکە تاوییەلی تێدا هەبێت .

راچڵەکین : هاومەبەستی ( داچڵەکین )ە .
چڵەك : ڕەگی چاوگی . چڵەك - ناوە بەواتای چڵێس بەرەوسن .
داچڵەکاندنو : ڕاچڵەکاندن - چاوگی ( دالی )ی تێپەڕن بەهەمان واتای - داترووسکاندن و ڕاپەڕاندنی گیاندار لەناکاو .
هەڵچڵەکین : بۆ جۆرە جووڵەیەك بەکاردێت ترسی تێدایەو جیاوازیی هەیە لەگەڵ ڕاچڵەکین .
٤٨ - چەوسان : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕ . بێ واتا .
چەوسانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی واتادار ، بەواتای ماندووبوون ، کارکردنی لەتوانا بەدەر .
چەوساندنەوە : چاوگی ( دالی )ی تێنەپەڕە ، بەواتای ماندووکردن ، کارکردن بەیەکێك زیاتر لەتواناو بەزۆر .
چەوسێ : ڕەگی فرمان .
چەوس : ڕەگی چاوگێ .
٤٩ - چۆڕان : چاوگی ئەلفیی تێنەپەڕی بێ واتا .
چۆڕانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕ ، بەواتای هاتنە خوارەوەی شتی شل .
چۆڕاندنەوە : خوارکردنەوە یان گوشینی شتێك بۆ هاتنە خوارەوەی ئەو شتە شلەی پێویەتیبان تێیدایە .

داچۆڕان : بۆ هەمان واتای چۆڕانەوە .
داچۆڕاندن : هاومەبەستی چۆڕاندنەوەیە .
چۆڕ : رەگی چاوگی چۆڕان ، داچۆڕان .
چۆڕان: رەگی چاوگی چۆڕاندن (چۆڕاندنەوەو داچۆڕاندن)و چاوگی بێواتایە .
چۆڕ : ناوە بەواتـای . کەم . بەش . بەڵام بۆ شتی شل وەك : ئاو . دەگوترێت : چۆڕێك ئاوم بدەیێ .
چۆڕەچۆر : جووتە ناو ـ بەواتای ـ هاتنە خوارەوەی شتی شل یەك لە دوای یەك . ئاو چۆڕەچوڕ لەبن میچەکەوە دێتە خوارێ .
چۆڕ : ناوی جووڵەو دەنگـــە(٥٥) ـ لێرەدا بەگشتی بۆ مەبەستی جووڵەو کارەکە بەکارهێزاوە . چۆڕێك ـ کەمێك، تۆزێك ، هەندێك، نە ختێك .
٥٥ ـ چووزان : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی بێواتا . یان بەتەنیا بەکارنەهاتوو .
چووزانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپـــەڕی واتادار ، بەواتای کزانەوە ، سووتانەوەی برین ئەنجامی ئازار یان دەرمانکردن .
چووزاندنەوە: چاوگی (دالی )ی تێپەڕە بەواتای برژاندنەوەی برین ، یان ئەو ئازارەی دەرمانکردنی برینە کە دەیکەیێنێت .

چووز(٥٦) : ڕەگی چاوگی تێنەپەڕ .
چووزان : ڕەگی چاوگی تێپەڕ .
٥١ - چەرخان : چاوگی تێنەپەڕی بەکارنەهاتوو بەتەنیا بەواتای سووڕان .
چەرخانەوە : چاوگی تێنەپەڕی واتاداری بەکارهاتوو بەواتای سووڕانەوە .
وەرچەرخان : هاومەبەستی چەرخانەوەیە .
چەرخ : ڕەگی چاوگە .
چەرخ : ناوە - بەواتای ( عجلة ) لەعەرەبیدا ، پێی ئۆتۆمبیلو پاسکیل هتە .
چەرخ : ناوە - بەواتای : سەدە ( قرن ) سەد ماڵ .
چەرخ : ناوە . بەواتای گەردشو وسووڕانەوە .
چەرخ : چەرخی بیر ، کە ئاوی پێ دەردەکرێت .
چەرخدان : چاوگی لێکدراوی پێکهاتوو لە : چەرخ + چاوگیدان بەواتای : سووڕاندن - تێپەڕ .
چەرخوفەلەك : جووتەناوەو ناوێکی تایبەتی یە بۆ جۆرە یاری یەك ( دولاب الهواء ) لەعەرەبیدا .
بۆنموونە : -
شەرتە چەرخت لەچەمەر دەرکەم . هەرەشەیە .
واتە ڕەگ‌وریشەت هەڵکەنم .
٥٢ - چرکان :

چرکاندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕ ، بەواتای کردنەوە تایبەتی‌یە بۆ لۆکە ( پەمبوو ) . بەواتای (حلج)ی عەرەبی .

چرك : رەگی چاوگی چرکان .

چرکان رەگی چاوگی ( چرکاندن )ە .

چرکە : ناوی‌دەنکە .

چرکاندن : دەرهێنانی دەنك‌و تۆوی ناولۆکەیـــە ، یان پاك‌کردنەوەی لەو شتانە .

٥٣ ـ چکان(٥٧) :

چکانەوە : ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی واتــادار ، بەواتــای ووشك‌بوونی ئاوی‌بیرو کارێز ، یان : ـ ئەنجامی مانەوەی شق شل لەسەر ئاگر بەرەنگێك خەست دەبێت‌و ئاوەکەی کەم دەبێتەوە .

چك : رەگی چاوگ .

چك‌چکە : چکچکە ناوە بۆ ئەو شوێنە لە شاخ کە داۆپ‌داۆپ ئاوی لێ دێتە خوارەوە .

ئەو چاوگانەی بە پیتی ( ح ) دەست پێ‌دەکەن :

٥٤ ـ حەوان : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی بەکارنەهاتوو بەتەنیا .

حەوانەوە : چاوگی ( ئەلفی ) تێنەپەرە بەواتای ـ گیربوون، حەواندنەوە : هێشتنەوە، راگرتن، چاوگی تێپەڕە هاومەبەستی

( لاواندن )ە ، منداڵەکە ناحەوێتەوە : گیرنابێت، بەنەنابێت ژێرنابێت .

حەوان: رەگی چاوگی ( حەواندن )ە .

حەو : رەگی چاوگی ( حەوان )ە .

حەو : ناوی دەنگی سەگە ، حەوحەو . دەنگی سەگە لە زۆر وەڕیندا . ـ واتە ـ ناوی دەنگە .

حەو : بۆ نارەزایی‌و بێزاربوون بەکاردێت : حەو خۆ هێشتا هیچی نەکردووە. ئەم ناوەو رەگی چاوگی حەوانو

حەوانەوە - یەکە :

حەوحەوکردن :

٥٥ ـ حەسان(٥٨) :

حەسانەوە : چاوگی ئەلفی‌ی تێنەپەڕی واتادار . بەواتای:ـ پشوودان .

وەحەسان : بەسەرچوونی ماندوێتی .

وەحەسانو حەسانەوە یەکن

حەساندنەوە : بەسەر بردنی ماندوێتی ، پشووپێدان .

بەڵکو دووا رۆژ بمحەسێنێتەوە . بەواتای بمخانە رەحەتی‌یەوە پاش ماندووبوون .

٥٦ ـ حلان (٥٩)

حلاندن

داحلاندن : داهێشتن ـ راهێلان .

ئەوچاوگانەی بە ( پیتی : خ ) دەست پێ دەکەن

٥٧ ـ خوڕین: چاوگی ( یائی ) ی تێپەڕی پێواتا

لێخوڕین : چاوگی ( یائی ) تێپەڕی واتادار ، بەواتای ئاژۆتن ( هاژۆتن ) . بەکشتی بۆجوولاندنی ئاژەڵ بە کاردێت ، بۆ رۆیشتن ،

تێخوڕین : چاوگی ( یائی ) ی تێپەڕی واتادار ، بەواتای تووڕەبوون لەیەکێك ، بەگژداچوون . پێداهەڵشاخان

پێداخوڕین : بەواتای خۆپیشاندان ، خۆبەگەورە بینین

خوڕ : رەگی چاوگ .

خوڕ ناوە : ناوی دەنگی ئاوێکە کە لەسەرەوە بێتە خوارەوە بە خێرایی . واتـــە لە هەمان کاتدا نیشانەی رۆیشتنە بە خێرایی . پەیوەندی لە نێوانی ـخوڕ وەك ناوی دەنگ و نیشانەی پەلەلێ کردن لەرۆیشتنداو رەگی چـاوگی ( خوڕین ) کە ـ ( خورە ) ـ هەیە . لەوانەیە لە ناوی خوڕ وەرگیرابێت .

خوڕەخوڕ جووتەناوە. بۆنموونە ـ خوڕەخوڕ ئاو دێتە خوارەوە یان خوڕەخوڕ فرمێسك دەڕێژێت .

٥٨ ـ خەنین (٦٠) : نەرمەپێکەنین ، پێکەنینی بێدەنگ .

خەنی : بناغەی چاوگ .

هەندێك ناوچەی کوردەواری دەڵێن(خەنی لە خۆت) بەواتای خۆشی لە خۆت . بێگومان ژیانی خۆش

پێکە نیی ژیانە لەگەڵ مرۆقدا . . .
خەن : رەگی چاوگە ـ .
خەندە : رەگ + پاشگرێ (دە) = خەندە ناوی فرمانە
وەك : ـ دیتن ـ دی ـ دەگی چاوگ ـ دیدە ـ
دی + پا شگری ( دە ) ، ناوی فرمان بەواتای
چاوخەندە ـ ناوی فرمانی ( خەنین ) .٨ .
زە ردە خەنە گرتی . زەردە ( خەندە ) یە .
٥٩ خولان : چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەڕی بەتەنیـــا
بەکارنەهاتوو .
خولانەوە : چاوگی ( ئە لفی )ی تێنەپەڕ بەواتای سووڕانەوە
خول : رەگی چاوگ .
خول خواردن : چاوگی لێکدراوی پێکهاتوو لە رەگی (چاوگی ـ
خولان) + چاوگی یارمەتی دەری خواردن. بەواتای
سووڕ خواردن یان خولانەوە ـ دەڵێین ـ مزراحەکە
دەخولێنەوەو سەرم خول دەخوات .
خولدان(٦١): چاوگی لێکدراوە وەك خول خواردن ـ کورد دەڵێت
خولێکم داو کەوتم ـ ئەنجامی گێژییە کە دەبێتە
هۆی خولانەوەی مرۆق ولەوانەیە کـەوتنی . بە
واتای سووڕدان دێت هەندێك جار هەرچەندە
سووردان بەواتای سەماکردنیشە .

٦٠ ـ خلەتان

خلەتاندن خەلەتاندمی ـ بەغەلەتدا بردمی . گزیی لێ کردم
کاڵتەپێ کردن .
هەڵخەلەتاندن بەهەمان واتای خلەتاندن ، فێڵ لێ کرون .
خەلەت ـ یان غەلەت (٦٦) ـ رەگی چاوگ .
٦١ ـ خورپان
داخورپان ـ داچڵەکین ـ لەترساندا : بەواتای دڵە لەرزێ
یان دڵە کوتێ بە مرۆڤ کەوتن . چاوگی ئەلفیی
تێنەپەڕە . دڵم داخورپا .
داخورپاندن چاوگی ( دالی ) ی تێپەڕ . بەواتای داچڵەکاندن
ترساندن . ولێ داخورپاندم :
خورپان رەگی چاوگی تێپەڕی خورپاندن .
خورپ رەگی چاوگی تێنەپەڕی خورپان
خورپە (٦٣) خورپ + پاشگری ) ـە ( ناوی فرمانە .
خورپە لە ـ دڵمەوە هات . هەمیشە لەگەڵ وشەی
( دڵ ) دا بەکاردێت و ناگوترێت . خورپام بە
واتای داچڵەکیم / یان ـ ترسام .
٦٢ ـ خڕان
خڕاندن
هەڵخڕاندن ـ چاوگی تێپەڕی ( دالی )ی واناداره بەواتای
خڕ کردنی شتێك . یان خستنە شێوەی خڕ .
خڕ رەگی چاوگی خڕان ـە .

خڕ ئاوەڵناوو ـ ناوە ـ بۆ نموونە : گوێز خڕە .
خڕبوون ـ چاوگی لێکداوی پێکهاتوو لە ( خڕ ) + بوون ـ
بە واتای شتێك خڕ ببێت نەك خۆی خڕ بێت ،
ئەویش ئەنجامی نەخۆشی یان ئازار پێ گەیشتن
بۆ نموونە : ملم خڕبووە . بن باخەڵی منداڵەکە
خڕبووبوو .
٦٣ ـ دۆڕان (٦٤)
دۆڕاندن چاوگی ( دالی )ی تێپەڕی دروست کراو بەواتای
زەرەرکردن ، لەکیس چوون . لەناوبرون ،
چواندن ، بە پێچەوانەی بردنەوەو دەست کەوتن
کورد دەڵێت : ـ سەر بدۆڕێنەو قسە مەدۆڕێنە .
دۆڕێن ڕەگی فرمانی ( دۆڕاندن ) .
دۆڕان ڕەگی چاوگی دۆڕاندنو چاوگی بێ واتا هەندێك
جار یان هەندێك شوێن ( دۆڕان ) بەکار دێنی
وەك چاوگێکی واتاداری تێنەپەڕ بەهەمان واتا ،
وەك : چاك دۆڕام ـ نەوتام .
٦٤ ـ درەوشان چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەڕی بەتەنیا بەکارنەهاتوو
درەوشانەوە چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەڕی واتادار ، بەواتای
بریسکانەوە ـ شەوق دانەوە بریقانەوە . ناوە لە
ناوەکانی ڕووناکیو گەشی .
ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە ـ ناوی ڕووناکییە .

ئەوچاوگانەی بەپیتی ( ر ) دەستپیدەکەن .

٦٥ ـ رشان : چاوگی ( ئەلفی ) ی تینەپەڕ .

رشانەوە ( ٦٧ ) ـ چاوگی ( ئەلفی ) ی تینەپەڕی واتادار ، بە واتای ) استفراغ کردن ) ، شتهەڵهینانەوە .

ئەنجامی پینەکەوتن ، یان نەخۆشیو سەرمابوون

٦٦ ـ رش رەگی چاوگ

رشێ : رەگی فرمان

٦٧ ـ رووتان ( ٦٦ ) چاوگی ( ئەلفی ) ی تێنەپەڕی بەتەنیا بەکارنەهاتوو .

رووتانەوە چاوگی ( ئەلفی ) ی تێپەڕی واتادار بەواتای هیچ نەمان ، یان ـ بۆ قژو موو بەواتای کەوتن قژم دەڕوتێنەوە .

رووت : رەگی چاوگ .

رووت : ناوو ناوەڵناو . بەپێچەوانەی : پۆشتە ـ لەواتادا

رووت وقووت : جووتە ناو

رووتێ : رەگی فرمانەو بەڵگەی بوونی چاوگی ئەلفییە .

رووتاندنەوە چاوگی ( دالی ) ی تێپەڕ بۆ هەمان واتا .

رووتان : رەگی چاوگ . چاوگ . رەگ : بو رووتاندن

رووتێن : رەگی فرمانی رووتاندن .

دارووتان : هیچ پێوە نەمان ـ داڕووسقان چاوگی تێنەپەڕی ئەلفی .

داروو‌تڕاندن : هیچ پێوه نه‌هێشتن ـ چاوگی تێپه‌ڕی ( دالی )
رووت‌بوونه‌وه : چڵداکه‌ندن ـ یان هیچ نه‌مان . چاوگی
لێکدراوی تێنه‌په‌ڕ .
رووت‌کردنه‌وه : چڵداکه‌ندن ـ به‌یاریده‌ی یه‌کێك ـ یان
هیچ نه‌هێشتن .
چاوگی لێکدراوی تێپه‌ڕی پێکهاتوو له : رووت
+ کردنه‌وه .
٦٨ ـ ره‌نجان :
ره‌نجاندن : چـاوگی ( دالی ) ی تێپـه‌ڕی واتاداری
دروست‌کراو نه‌ك بنجی ، به‌واتای ـ دڵشکاندن
ئازاردان ، بۆنموونه : ـ دلم مه‌ره‌نجێنـه دل
ناسکه .
ره‌نج ـ ره‌گی چاوگی ره‌نجان .
ره‌نج : ناوه . زه‌حمه‌ت‌کێشان . ماندووبوون . زه‌حمه‌تی )
ماندوێتی : ره‌نجم به زایع ( ضایع ) چوو ،
به هیچ ده‌رچوو .
ره‌نجبه‌ر ( ٦٧ ) : ناوی بکه‌ری دروست‌کراو له : ره‌نج +
پاشگری ( ه‌ر ) .
٦٩ ـ ره‌نگان ( ٦٨ )
ره‌نگاندن : چاوگی ( دالی ) ی تێپه‌ڕی دروست کراو له
ناوی ره‌نگ + پاشگری ئاندن به واتای ره‌نگ

کردن .

رەنگ : ناوە

رەنگان : رەگی چاوگی ( رەنگاندن ) ە .

رەنگێن : رەگی فرمانی ( رەنگاندن ) .

رەنگین : رەنگ + پاشگری ( ین ) ـ ناوەو ئاوەڵناوە بەواتای رەنگاو رەنگ ، بۆ نموونە : ـ

بچۆ سەر گردی یارە ببینە له جیهاندا گوڵێکی رەنگینە

رەنگە : ناوە بە واتای لەوانەیە ، دەگونجێت وابێت .

کاتێك بەکاردێت کە ئەو کەسە لە شتێك بەتەواوی دڵنیا نەبێت بەڵکو دوو دڵ و گومانی هەبێت ، یان ئەو شتە لە ئەگەرو نەگەردا بێت . هەر وەك کورد دەڵێت .

رەنگاورەنگ : جووتە ناو

رەنگ‌وروو : جووتەناو .

٧٠ ـ رچکان

رچکاندن : رووت کردنەوە

چاوگی ( دالی ) تێپەری دروست کراو بەیاریدەی ئاندن .

تاڵان کەرەکان کاروانەکەیان ئەرچکاند ـ رووت کردەوە . واتە هیچیان پێ نەهێشتن

٧١ ـ سووران

هەڵسووڕان : چاوگی ( ئەلفی ) ی تینەپەڕی واتادار ، بە
واتای کارکردن .
سووڕانەوە : خولانەوە ، هاتوچۆکردن . چاوگی ( ئەلفی ) ی
تینەپەڕ .
داسووڕان : بە واتای هەڵسووڕان ، هەڵسووڕانو داسووڕان
پێکەوە بەکاردێن . وەك : - بە درێژایی رۆژ
هەڵدەسوەڕێمو دادەسووڕێم .
سووڕ : رەگی چاوگێ
سووڕ : ناوە بە واتای سەما .
سووڕخواردن : خول خواردن .
سووڕدان : سەما کردن .
سووڕاندنەوە : خولاندنەوە تێپەڕە .
هەڵسووڕاندن - بەڕێوەبردن - تێپەڕە .
سووڕان رەگی چاوگی ( سووڕاندن ) ـە :
٧٢ - سازان ( ٦٩ ) : چاوگێکی ( ئەلفی ) ی تینەپەڕە ، بە
واتای رێك کەوتن بەڵام بەکارهێنانی کەمبۆتەوە ،
تەنیا ئەوەندە بەکاردێت - بۆ یەکێك زوڕ بکێشێتو
زوو رێك نەکەوێت ، ڕەکوترێت : هـەر
نەسازای ؟ . قەر ناسازێت . کەی دەسازێ .
٧٣ - شاردن - شارتن : - چاوگی ( دالی ) ی تێپەڕی بەتەنیا
بەکارنەهاتوو .

شاردنەوە : چاوگی ( دالی ) ی تیپەڕی واتادار ، بەواتای
داپۆشینی شتێك بۆ نەبینینی لەبەرهۆیەك ، یان
خۆمات‌دان .
ئەشاردن : چاوگی ( دالی ) ی تیپــەڕو واتادار وەك :
شاردنەوە .
ئەشارتن : هاومەبەستی شاردنەوەیە .
شار : رەگی فرمان .
شار : ناوە بۆ شوێنێك ئاوەدان‌و وپیشکەوتوو بێت لە چاو
دێهات‌و گوند .
چاوشارکێ : ناوی ( یاری ) یە بەگشتی منـــدالآن ئەم
یاری‌یە دەکەن ، پێکهاتووە لە چاو ( ناو ) +
رەگی فرمان ( شار ) + پاشکری ( کێ ـ *ke* )
٧٤ ـ شاخان : چاوگی ( ئەلفی ) ی بەتەنیا بەکارنەهانوو و
هەڵشاخان تووڕەبوون ، بەگۆڕدا چوون بۆنموونە : کەم بەو
مندالەدا هەڵبشاخێ .
شاخ : رەگی چاوگ .
شاخ : ناوە بە واتای : کێو ، چیا .
شاخ : بەواتای قۆچ ( بۆ ئاژەڵ ) .
٧٥ ـ شوبهاندن : چاوگی ( دالی ) ی دروست‌کراو بە یاریدەی
( پاشکری ـ ئاندن ) . دەگوترێت : دەیشوبهێنمە
یەکیك ـ واتە : لە یەکیك دەچیت . هەروەها

شوبهە لە فلان کەس دەکەم ، واتە : باوەڕی ـ
پێناکەم ، یان گومانی لێدەکەم ( شوبهە ـ
لێ کردن ) ئەم دووانە . جیاوازن لە واتادا ـ
سەیری پەراوێزی باسەکە بکە .

٧٦ ـ شیان ئەمە لە شێوەی خوارووودا کەم بەکار دێت ، بەڵکو وەکو ( سازان ) ـە تەنیا دەگوترێت : قەد ناشیت وای کردبیت بەواتای ـ ناکرێت ـ نابیت یان : دەشیت وابێ ـ بەواتای ـ دەکرێت وابیت لە شێوەی ژووروودا بەتەواوی بەکاردێت وەك هەر چاوگێو فرمانیکی سەربەخۆ . وەك : ئەز دشیم . یان ـ ناشیم . یان ـ بەواتای دەتوانم ـ یان ـ ناتوانم ـ کەواتە ـ بەواتای توانین ـ یان شایانی ئەو کارەم . . هەر وەك : هەندێك جیاوازییان تیدایە لەواتادا بەڵام لە بنجدا لەیەکەوە نیزیکن لەوانەشە هەر یەك بن .

٧٧ ـ ڤاران :

غاراندن : پێست کردن بە مەشکە ، یان دروست کردنی مەشکە کە لە پێست دروست دەکرێت . ئەم چاوگە چاوگێکی تێپەڕەو (دباغە)ی عەرەبی دەگرێتەوەو بە یاریدەی ( پاشکری ئاندن ) دروست بووەو

یەکـەر بووە بە تێپەڕ نەك لە تێنەپەڕەوە ، دەشکوترێت ( خاراندن ) .

غار(٧٦) : رەگی چاوگی ( غاران )ە ئەگەر هەبێت .

غارێن : رەگی فرمانی ( غاراندن )ە . پێستەکە دەغارێنێ

غارغارێن(٧٧) : ناوی یارییە بەواتای راکردن ، ئەمە لە غارێکهاتووە بە دووبارە کردنەوەیو بەیاریدەی پاشگری ( ێن - en ) .

٧٨ - فریوان : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی بێواتا .

فریواندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕی بە تەنیا بەکارنەهاتوو

هەڵفریواندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕی واتادار بە واتای تەفرەدان، هاندان، پاڵپێوەنان بۆ کردنی کارێك

فریو : رەگی چاوگی - فریوان .

فریودان : بەواتای - هەڵفریواندن بەلاَم هـەڵفریواندن چاوگێکی دروست کراوەو فریودان لێکدراوەو لە رەگی چاوگ : فریو+ چاوگی دان دروست بووە ، یان - فریو - ناوەو بەلاَم بە تەنیـا بەکارنایێت هەر چەندە لە ناوەرۆکدا واتای خۆی پاراستووە .

٧٩ - فلیقان : چاوگی (ئەلفی)ی تێپەڕی بەتەنیا بەکارنەهاتوو

هەڵفلیقان : پلیشانەوە . ووردکردن ، دارزاندن بە دەستو پێ ، وەك : ئەمانەکە هەڵفلیقاوە واتە فلیقاوەتەوە -

چاوگی ئەلفی ی تینەپەڕ .

فلیقانەوە : پلیشانەوە ـ تینەپەڕی ئەلفی ـ پان بوونەوە .

فلیقاندنەوە : پلیشاندنەوە ـ تیپەڕی ئەلفی و هاومەبەستی هەڵفلیقاندنە هەروەها بەواتای پان کردنەوە .

فلیقان : رەگی چاوگی فلیقاندنەوەیە .

فلیقان : لقی دوو پەلی درختە . واتە ناوە بۆ لقێك دوو پەلی هەبێت .

فلیق(۷۷) : رەگی چاوگی فلیقان ، هەلفلیقان ، فلیقانەوەیە

۸۰ قرچان :

هەڵقرچان : تێك چوونی شت ئەنجامی سووتان وەك سووتان و گرژبوونەوەی پێست . ئەمە چاوگێکی تینەپەڕی ( ئەلفی )یەو واتا دارە ، بۆ نموونە : گۆشتەکە هەڵقرچا ، رۆنەکە هەڵقرچا ، بەواتای زۆر داخ بووە .

قرچ : رەگی قرچانە .

قرچەقرچ : ناوی دەنگی شتی سووتاوە .

قرچانەوە : بە هەمان واتای هەڵقرچان و دووبارە چاوگێکی تینەپەڕە ، واتە بۆ روون و بۆ خەڵووزو بۆ برین و بۆ گۆشت بەکاردێت و بەواتای سووتان و هەڵکڕوو ـ زان و هەڵپڕووکان دێت لەگەڵ هەندێك جیاوازیدا هەروەها قرچانەوەی برین بەواتای :

کزانەوەو بژرانەوەی ئەنجامی دەرمان‌کردن .

داقرچان : بەواتای شکان بۆ دار - بۆنموونە دارەکە داقرچا بەواتای شکا .

قرچ : رەگی چاوکێ .

قرچە - : یان قرچەقرچ . ناوی‌دەنگە . قرچە لە دارەکەوە هات . دەنگ .

قرچە : لەهەمان کات‌دا ئەنجامی کارێکە کە بەرەو سووتاندن یان سووتاندنێکی کەم دەکەیێنێت ، لەبەر ئەوە ئەم ناوە بۆ هەردوو مەبەستەکە بەکاردێت بەگوێرەی بەکارهێنان و شوێنی بەکارهێنان لەیەکدی جودادە - کرێنەوە . وەك قرچە لە دڵمەوە هات. بۆ هەردوو مەبەست .

قرچۆك : قرچ + ۆ + ك = قرچۆك - بۆ شتێکە وەك بەرگ‌و پەت کە پچرپچر ببێت ، واتە بە ئاسانی بپچرێت لەبەر کۆنی‌و زۆرمانەوەی لەبەر هەتاو کەوما . ئەم پەتە قرچۆکە .

قرچۆك : ناوی‌بکەرە - ئاوەڵناوە - بەواتای رەزیل پیسکە قرچە :

قرچەقرچ‌کردن : یان قرچەقرچ‌هاتن . چاوگی تێپەرو تێنەپەری لێکدراو لەناوی دەنگی - قرچەقرچ + کردن ، هاتن .

٨١ قولین(٧٨) :

هەڵقولین : ناوەکە هەڵقوڵی ـ

چاوگی تێنەپەڕی ( یائی ) بەواتای دەرپەڕین و بەرزبوونەوە .

قوڵ : رەگی چاوگ .

٨٢ ـ قورتان : چاوگی بێ واتا .

هەڵقورتان : چاوگی بێ واتا .

هەڵقورتاندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕی واتادار ، بەواتای خۆتێ هەڵسوون ، خۆ لەشتی خەلکەوە گلاندن ، خۆ تێکەڵ کردن بە کارێك پەیوەندیی بەو کەسەوە نەبێت . بۆنموونە خۆی لەهەموو شتێك هەڵدەقورتێنێت .

قورت(٧٩) : رەگی چاوگی قورتان .

٨٣ ـ قوڕان :

هەڵقوڕان :

هەڵقوڕاندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕی دروستکراوی واتادار بەواتای ـ خواردنەوەی شتی شل زوو ، لەپڕ ، یەکسەر وەك : تا ئاوڕم دایەوە چاکەی هەڵقوڕاند .

٨٤ ـ قۆستن :

قۆستنەوە : چاوگی ( تائی )ی تێپەر ، بەواتای خواردن دێت ، خواردنێکی تایبەتی ، وەك ـ ئیسقان

قۆستنەوە واتە پاككردنەوەی لە گۆشت ، ئارادەی ڕووتكردنەوەی .

قۆس(٨٠) : ڕەگی چاوگ .

٨٥ ـ كرووزان :

كڕووزانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی دروستكراو بەواتـای ـ هـەمیشـە نـارەزایی دەربڕینو گلەیی كردنو خۆ دەرخستن بە كزیو ماندوویی بەواتای كریان بۆ حاڵی خۆی . فلان كەسی هەر دەكرووزێتەوە .بۆ منداڵی كرینۆكیش دەكوترێت هەر دەكرووزێتەوە .

هەڵكڕووزان(٨١) : دانی شت بە ئاگردا بۆ پاككردنەوەی لە تووكو لە موو . یان كەمێك سووتانی قژو موو . خوریەكە هەڵكرووزا .

كڕووز : ڕەگی چاوگی كڕووزانەوەو هـەڵكڕووزان بۆن كرۆوز دێت ـ بەواتای بۆنی شتی سووتاو دێت كە تووك داربێت ، واتە ناوی بۆنی جۆرە سووتانێكی تایبەتی یە . نەك بۆ هەموو شت . یان دەكوترێت : ئەوەندە خەفەتم دەخوارد بۆن كرووز لە لووتمەوە دەهات .

هەڵكڕووزاندن : تێپەڕی ( هەڵكرووزان )ە وەك : خوریەكەم هەڵكڕووزاند .

کڕووزاندنەوە : تێپەڕی ( کرووزانەوە )یە : کەم منداڵەکە بکڕووزێنەوە . بەواتای کەم بیکە گری . یان بیخەرە کریان .

٨٦ ـ کزان :

٨٧ ـ کزانەوە : چاوکی تێنەپەڕی وأتادارە ، بەواتای چووزانەوە سووتانەوە . برژانەوە .

کزاندنەوە : تێپەڕە بەهەمان واتا ـ .

کز : رەگی چاوکی تێنەپەڕ .

کز : ناوەڵناوە ـ بەواتای ـ مات ، ماتومەلوول ، غەمبار

کز : دەشکوترێت فلان کەسی حالی کزە ، واتە باش نی‌یە دەست کورتە . هەژارە .

کز : دووبارە بەواتای کزی‌و کەم شەوقی بۆ رووناکی بەکاردێت وەك : چراکە کزە .

کز : بۆ بایەکی خوشی کەمە ساردی‌یەکی تێدابێت بەکار- دێت‌و دەگوترێت کزەبا . بۆ نموونە :

ئەیبا بەسەرما کزە بای بەیان

ئەیلەرانەوە کوڵڵەو پەردەکان

کز : کزە لە جەرگمەوە هات .

یان : کزەی جەرگانم ماڵی وێرانم

ئـــەمشەو دوو شەوە لای تۆ میوانم

٨٨ ـ کەنین(٨٢) : چاوکی ( یانی )ی تێنەپەڕ ـ بـــەواتای

پێکەنین .

پێکەنین : چاوگی ( یانی ) تێنەپەر . بەهەمان واتای کەنین

٨٩ ـ کەوان(٨٣) : ئەمە بەم جۆرە بەکارنایێت .

کەواندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕ بەواتای (داغ کردن)ی برین ، یان شوێنێك ئازاری هەبێت . ئەمــە پەیوەندی‌ی بەوکەواندنەوە نی‌یە کە تێپەڕی کەوتن‌و هاومەبەستی ( خستن )ە .

٩٠ ـ کڕان :

کڕاندن : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕی دروست کراو بەواتای شتێك لەشتێك کردنەوە . هەڵکەندن ، بەتایبەتی بۆ خواردن بەکاردێت .

کڕاندنەوە : بەواتای قۆستنەوە ، وەك : سەگەکە ئێسقانە-کەی کڕاندەوە .

چاوگی تێپەڕی دروست کراو .

هەڵکڕاندن : چاوگی تێپەڕی واتادار ، بەواتای ـ خۆخوراندن بەتوندی نەك لەسەرخۆ . هەندێك جار بەتەوسەوە دەگوترێت فلان کەسی هەر خۆی هەڵدەکڕێنێت

کڕێن : رەگی فرمانی (کڕاندن ـ کراندنەو، هەڵکڕاندن)ە

کڕ(٨٤) : رەگی چاوگی ( کران )ە . دەگوترێت بن‌کڕ ( بنکڕ ) بەو خواردنە دەگوترێت کە ووشك دەبێتەوەو دەنووسێت بە بنی مەنجەڵەوە .

٩١ ـ کۆلین :

هەڵکۆلین : چاوگی (یائی)ی تێپەڕ ، بەواتای کون کردنو چاڵ کردن دەگوترێت کەم لووتت هەل بکۆلە ـ بە یەکێك کە هەر دەستی لەلووتیدا بێت .

کۆلینەوە : چاوگی تێپەڕی یائی . بە واتای ووردبوونەوەو پشکنینەوەی شت .

لێ کۆلینەوە : بە هەمان واتای ـ کۆلینەوە .

لێم کۆلییەوە دەرکەوت وانی یە .

کۆڵ : رەگی چاوگی ( کۆلین ، هەڵکۆلین ، کۆلینــەوە لێکۆلینەوە ،

کۆڵ : ناوە بەواتای پشت . بار .

٩٢ ـ کۆشان . کۆشین :

تێ کۆشان : چاوگی تێنەپەڕی ئەلفیو ( یائی )ی بە واتای ( هەوڵدان .

تێ کۆشین : تەقەلادان ، هەوڵو تەقەلادان )ە .

کۆشی : رەگی چاوگە .

کۆشش(٨٥) : کۆش + پاشکری (ش) . ناوی فرمانی ( تێکۆشان )ە بەواتای : هەوڵوتەقەلا .

کۆشی : ناوە ـ بەواتای ـ باوەش ، ئامێز .

کۆشی : بناغەی چاوگی ـ کۆشین ـ تێ کۆشین ـە . کورد دەڵێت : کردمو کۆشیم بمێنێنەوە رازی نەبوو .

( کرد - بناغەی چاوکی کردن ، کۆشی بناغەی
چاوکی کۆشین ) ـ بەواتای زۆرلێ کرەن ، نارادەی
پاڕانەوە بۆ شتێك ، یان بۆ رازیبوون و
رازیکردن .
کردنوکۆشین : پێکەوە جووتە ناویان پێکهێناوە .
کردنوکۆشان : کردموکۆشام فایی نەبوو . (بێفائدەبوو) .
کولان :
٩٣ ـ کولانەوە چاوکی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕی واتادار ، بەواتای
ئازارگەیشتن بە شوێنێك بریندار بێت ، تازەبوونە-
وەی برین .
کول : رەگی چاوك .
کول : ئاوەڵناوو ناوی فرمانە بەواتای ، بریندار ، ناساغ
وەك : منداڵەکە چاوی کولە ـ چاوی دێشێت
دەستم کول بوو ـ بریندار بوو .
کول : بەپێچەوانەی واتای تیژ بەکاردێت وەك : چەقۆکە
کولە ـ کولبووە . دەشکوترێت میشکی کولەو
فێرنابێت .
کولاندنەوە : ئازار بە برین گەیاندن ـ تێپەڕی کولانەوەیە
ئەم چاوگە تێپەڕی هەیە .
٩٤ ـ گیرسان :
داگیرسان : چاوگی تێنەپەڕی (ئەلفی)یە بەواتای ـ هەڵبوون

پێبوون - بۆ ناکرو چرا .
هەروەها بەواتای دامێزران تا لێهاتن وەك : -
هەموو لەشم داگیرساوە - واتە گەرمبووە تام -
لێهاتووە .
هەڵگیرسان : بەهەمان واتای داگیرسان .
داگیرساندن : تێپەڕی داگیرسان .
هەڵگیرساندن : تێپەڕی - هەڵگیرسان .
ئەم چاوگە بەیاریدەی دوو پێشگر بوون بەهاو-
مەبەستی یەکتری پاش بوونی بە دوو چاوگی
واتادار . بەتێپەڕو تێنەپەڕەوە .
گیرسانەوە : گیربوون یان وەستانەوە لەشوێنێکدا بەتایبەتی
پاش هەڵدان یان کەوتنە خوارەوەی شتێك کە
بکەوێتە سەر شتێك بەرز بێت یانێ بشالێتو
رێکەی هاتنەخوارەوەی لێ بکرێت هەندێك جاریش
گیرسان بەتایبەتی لە شیعرو فولکلۆردا بەکاردێت
وەك : ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دلی من ؟
یاخۆ بە چ داخێکەوە سووتاوە دڵی من ؟
٩٥ - کلۆفتن :
هەڵ کلۆفتن : چاوگی ( یانی )ی تێپەڕ بەواتای گوشینو
لەیەك خستنی شتێك بۆ ووردکردنو فلیقاندنەوە-
وەك - تریو تەماتەو هتد - یان بۆ پاككردنە -
وەی : جلو بەرگ کاتی شوشتنی . وەك : جلەکان

باش هەڵبگلۆفە با باش پاك بینەوە .

گلۆف : رەگی چاوگ و فرمان .

٩٦ ـ گەشان :

گەشانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تینەپەڕ .

گەش : رەگی چاوگ .

گەش : ئاوەڵناوە .

گەش بوونەوە :

گەش کردنەوە :

گەش کە : شاکەشکە بوو لە خوشی‌دا .

گەش + کە = گەشکە .

گەشگە گرتی .

گەشە : گەش + پاشگری ە = گەشە ـ ناوە .

٩٧ ـ گواستن : یان ـ گوهاستن .

گواستنەوە : چاوگی ( تائی ) .

بەواتای گۆیزانـەوە ـ بەواتای جێ‌گۆڕین و

شوێن گۆڕین لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك

٩٨ ـ گوێزان : چاوگی بێ‌واتا .

گوێزان : ناوە .

گوێزانەوە : بەواتای گواستنەوە .

گوێز : رەگی چاوگ .

گوێز(٨٦) : ناوە .

٩٩ ـ کلان :

کلاندن : چاوکی ( دالی ) .

تێوەکلاندن : چاوگی (دالی)ی واتادار بەواتای خۆتێکەڵـ
کردن لە شتێك دا پەیوندی بەوکەسەوە نەبێت
وەك = تێهەڵقورتاندن .
خۆی لە هەموو شتێکەوە دەگلێنێت .

کلان : رەگی چاوکی گلاندن .

کل : رەگی چاوکی کلان .

کل : ناوی نەخۆشی‌یەکە تووشی چاو دەبێت وەك ژانێکە
بە چاودا دێت‌و دەروات .

کلەیی : سکاڵا

کل‌دانەوە : کل + دان + وە = کلدانەوە . هێشتنەوەی
کەسێك یان شتێك بۆ مەبەستێك .

١٠٠ ـ لۆشین :

هەڵلۆشین : خواردنەوی شت بەدەنکێکەوە لە دەنکی لووت
دەچێت ـ ، دەرمانەکەی هەڵلۆشی .

لۆش : رەگی چاوکێ . هەر چلم هەڵدەلۆشێ .

لووشەلووش :

لوشکان : وەك : (لۆشین)ە لوشك ـ رەگی چاوکێ. لووشکە ـ
لوشك ـ واتا لووشەلووش بە جۆرە کریاتێکە .
لووشکەلوشك دەکری . .هەر لووشەی دێت .

۱۰۱ ـ لاوان :

لاواندن :

لاواندنەوە :

لاو : رەگی چاوگی لاوان .

لاو(۸۷) . گەنج ـ ئاوەڵناوو ناوە ـ لاوك(۸۸) .

لاوان : رەگی چاوگی (لاواندن)و ـ کۆی ـ لاو ـە .

لاولاو :

لاوێن : رەگی ( فرمان )ی ( لاواندن ) .

۱۰۲ ـ لالان :

لالانەوە :

لال : رەگی چاوگ .

لال : ئاوەڵناوە ـ بۆ ئەو کەسە بەکاردێت کە زمانی نەبێت و نەتوانێت قسە بکات ـ ئەنجامی نەخۆشی یان بەزگماك .

لالان : کۆی ـ لال ـ ە .

لالانەوە ـ لە ـ لال ـ دروست بووەو بووە بە چاوگی بەکارنەهاتوو بەتەنیا ـ بەیاریدەی نیشانەی چاوگ و بە یاریدەی پاشگری ( وە ) بەکاردێت پەیوەندیش ئاشکرایە لە نێوانی هەردوو لادا .

۱۰۳ ـ لەران : لەرین :

لەرانەوە : چاوگی (ئەلفی)ی تێنەپەڕ بەواتای جوولانەوە.

شەکانەوە . یان ـ لەرینەوە (چاوگی : یانی)(٨٨)
لەراندنەوە : چاوگی ( دالی )ی تێپەڕ بەواتای جوولاندنەوە.
شەکاندنەوە .
لەر(٨٩) : رەگی چاوگی ( لەران ) و ( لەرانەوە ) .
بۆ نموونە :

ئەوڕۆ بەسەردا کزەبای بەیان
ئەیلەرانەوە کوللەو پەردەکان

١٠٤ ـ لێسان : یان لێستن .
لێسانەوە : لێستنەوە .
لێستنەوە(٩٠) : ئالاستن ـ لە شێوەی زۆرروودا بەکاردێت
وەك قۆستنەوە وایە ـ بەلام ـ قوستنەوە بەدانەو
لێستنەوە بەزمان .
١٠٥ ـ مووسان(٩١) : چاوگی ( ئەلفی )ی تێپەڕی بێواتا .
رامووسان : بەواتای ماچ کردن .
١٠٦ ـ مرکان :
دامرکان : ئارام گرتن . لە جوولەکەوتن . هاتنەوەسەرخۆ
دامرکانەوە : کز بوونو کوژانەوەی ئاگر . تێنەپەڕە .
دامرکاندنەوە : تێپەڕی ( دامرکانەوە ) یە .
بۆنموونە :

سەد جوانی تر هەر وەکو ئەو جوانانە
نەی توانیوە دامرکێنێ ئەم گیانە

١٠٧ ـ مەزران :

دامەزران : چاوگی (ئەلفی)ی تێنەپەڕ بەواتای جێگیربوون لەشوێنێك بۆنیش‌کردن . بوون بەمووچەخۆر . ( تعیین ) بوون .

دامەزراندن : چاوگی (دالی)ی تێپەڕ ـ بۆ هەمان مەبەست دانان . ( تعیین ) کردن لە شوێنێك .

١٠٨ ـ نوشتان :

نوشتانەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕ بەواتای ـ دانەوێنەوە . چەمینەوە .

نوشتاندنەوە : چاوگی ( ئەلفی )ی تێپەڕ بۆ هەمان واتا . دانەواندنەوە ، چەماندنەوە .

نوشت : بناغەی چاوگی ـ نوشتان‌و نوشتانەوە .

نوشتە : ناوە بۆ جۆرە دوعایەك ـ کە ـ دەپێچرێتەوەو دەنوشتێنرێتەوە ـ بۆیە پێی دەگوترێت نوشتە .

١٠٩ ـ نوتین :

هەڵنوتین : چاوگی ( یائی ) تێنەپەڕ ـ بەواتای رەت‌بردن

١١٠ ـ واسین :

هەڵواسین : چاوگی ( یائی )ی تێپەڕە بەواتای کردنی شتێك بە شوێنێکی بەرزدا .

یان : هەڵواستن‌و هەڵاوێستن .

واس : رەگی چاوگ‌و فرمانە .

واس‌واس : ئاوەڵناوە بەواتای دوودڵی لەشت .

١١١ ـ وەشان :

داوەشان : داوەشان هەلاهەلابوونو دارزان . داوەشاو ـ ئاوە ڵناوە بەواتای تەمەڵو لەش قورسی . وەك دەگوترێت لە دوعا ـ کردندا لەیەکێك : دەك لەشت داوەشێت وەك داوەشاوە .

ئەم چاوگە (ئەلفی)ی تێنەپەڕە بەواتای (دافرتان) یش دێت . یان پارچە پارچەبوون ئەنجامی کۆنیی شتێك یان سوووتانی ئەو شتە .

هەڵوەشان : لێكبوونەوەو جودابوونەوەی دوو شت کە لێك ـ درابێت بە درووومان یان بەهەر شتێك . دووبارە چاوگێکی ( ئەلفی )ی تێنەپەڕە .

داوەشاندن : لەگەڵ هەڵوەشاندن چاوگی تێپەڕی ( داوەشانو هەلووشان )ن بە یاریدەی پاشگری ( ئاندن ) دروست‌بوون ، هەروەها بەواتای دەست‌هەڵهێنانە وەش دێت کاتی لێدان .

راوەشاندن : چاوگێکی ( دالی )ی تێپەڕی دروست‌کراوە بەواتای جولاندنەوەی‌شت ، یان دانی بەم لاو بەولادا . وەك : سەری راوەشاند، سەرراوەشاندن بەواتای (نا )ش دێت واتە رازی نەبوون لەسەر شتێك ، یان کاتی تێ‌نەگەیشتنی شتێك بەکاردێت.

تێوەشاندن : وەشاندنو جوولاندنەوەی بەرگێو کالاّ لە سەر ئاگرو بەڕەو ئاگر دووبارە چاوگێکی ( دالی )ی تیپەڕی دروست کراوە .

ڤەوەشاندن : تیپەڕی دروست کراوە بە واتای لڤلڤاندن ، لەرزاندن ، راوەشاندن .

دەستوەشاندن : چاوگێکی لێکدراوی تیپەڕە بەواتای دەستهەڵبڕین بۆ لێدان .

دەستلێوەشاندن : ئەمە (مجازاً) بەکاردێت وەك دەگوترێت دەستیان لێ وەشاندووە بەواتای شێت بووە ، یان شێتەو جنۆکە لێی داوە دەشگوترێت دەستی خۆی وەشاند دووبارە ( مجازاً )ە بەواتای کاری خۆی ـ کردو زیانی خۆی گەیاندو زەبری خۆی نیشاندا واتە ئەوەی لەدەستی هات بەخراپە کردی .

وەشێن : رەگی فرمانی چاوگە تیپەڕەکانە وەك : دەست رامەوەشێنە ( شێن ) .

باوەشێن : ناوە پێکهاتووە لە وشەی ( با ) + رەگی فرمان ( شێن ) بەو شتە دەگوترێت کە کاتی گەرما یان بۆ ئاگر گەشاندەوە بەکاردێت

ئەو چاوگانەی بە پیتی ( هـ ) دەست پێدەکەن :

١١٢ ـ هێزران :

داهێزران : چاوگی (ئەلفی)ی تێنەپەڕ بەواتای لەش تێك چوون و قورس بوون بە هۆی نەخۆشی یان ماندووبوونەوە. یان هێز نەمان .

داهێزران : بەواتای شل بوونەوەو ئاودانەوەی هەویر لەبەر زۆرمانەوەی دەڵێن : هەویرەکە داهێزراوەو نانی لێنایەت .

١١٣ ـ هێنجان :

هەڵهێنجان : دەرهێنانی ئاو لە نزمی یەوە بۆ بەرزی و بۆ سەرەوە . چاوگێکی تێپەڕی ( ئەلفی )یە .

هێنج(٩٢) : رەگی چاوگ و فرمانە .

١١٤ ـ هۆنین :

هۆنینەوە : ریز کردن و رێکخستنی قژی درێژ، چاوگێکی تێپەڕە .

هۆندنەوە : بەواتای هۆنینەوە ـ چاوگێکی ( دالی )یە .

ڤەهاندن یان ڤەهۆندن : هۆنینەوەو هۆندنەوە .

هۆن : رەگی ( چاوگ و فرمان )ی هۆنین و هونینەوە .

هۆن : یان هۆنهۆنه ـ وەك : هۆنەهۆنه فرمێسكی دەرشت واتە ریزو [illegible] ەر یەك ...

پەیوەندیی نێوانی : هۆنه وەك ناو لەگەڵ رەگی چاوگ‌و فرمان‌و واتای چاوگ‌و فرمانەكە ئاشكرایه هۆنینەوەی تۆ ـ پێچانەوەی بەشێوەیەكی رێك‌و ریزكردنێكی دیار ـ وەك ـ رشتنی فرمێسك بەریزو یەك لەدوای یەك .

## پەراویزەکان : ـ

(١) ئالاّن ـ دەزووەکە لە کولەکەوە ئالا ـ پەتێك لە ملی مەڕەکە ئالاّوە . ئەگەر سەرنجی ئەم دوو ڕستەیە بدەین دەردەکەوێت کە ( ئالاّن ) لەو فرمانانەیە کە جوولەو نیشانەی جوولەی تێدایە بەرەو لایەکی تر یان شتێکی دی، ئەمجۆرە فرمانانە زۆرن و لە هەموو زمانێکدا هەن بەم جۆرەش لە زمانی کوردیدا ، بەلاّم ئەگەر سەرنجی ئەو فرمانانە بدەین کە لەم شێوەیەن لە زمانەکەماندا دەبینین بەگشتی ئەو ئامرازانەی یارمەتی ی جێ بەجێ بوونی ئەم کارە دەدەن لەرستەدا دەبن بە پێشکرو پێش فرمانەکە دەکەون بەتایبەتی ئەگەر راناوی لکاو بەکارهێنرا ، وەك مارەکە خۆی لە درەختەوە ئالاّندووە ـ لێی ئالاّوە ، دەزووەکە لە کولەکانەوە ئالاّوە ـ تێیان ئالاّوە ـ تێ ئالاّن ، یان ئالاّون ـ لێك ئالاّن هتد . . . هەروەها ئالاّن و ئالین یەکن تەنیا جیاوازییان لە نیشانەی چاوگەکەدایە .

(٢) شێخ محمدی خاڵ . فەرهەنگی خاڵ . بەرگی یەکەم . سلێمانی ١٩٥٩ . ل : ٥٥ ـ ٥٦ .

(٣) ئاڵ ـ کوتمان کـە رەنگی چاوکێ و ناوی جۆرە رەنگێکی سوورە لە هەمان کاتدا ئەفسانەی ( دایکی ئاڵ ) هەیە لە کوردەواریدا ـ لە ناو گەلانی تریش بێ گومان هـەیە بەلاّم رەنگە بە جۆرێکی دیکەو ناوێکی تر بێت ـ (دایکی ئاڵ) بەوە ناسراوە کە رقی لە هەر ئافرەتێکە منداڵی ببێت و

ببێت به دایك چونكه خۆی مندالی نی‌یه‌و نایبێت ، بۆیه
له‌و ئافره‌ته ده‌نالێت‌و بۆ هه‌لێك ده‌گه‌ڕێت تا زه‌نه‌ری پێ
بیات‌و بیخنكێنێت ـ بێ‌گومان په‌یوه‌ندی له نێوانی ( ئاڵ )
له ( دایكی ئاڵ ) و ( ئالآن ) دا ئاشكرایه بۆیه له‌وانه‌یه
یه‌كێكیان له‌وی تره‌وه وه‌رگیرابێت . به‌لآم پێویسته له
ره‌نگی ( ئاڵ ) زیاتر بكۆڵرێته‌وه ، چونكه له‌وانه‌یه
په‌یوه‌ندی هه‌بێت‌و له‌وانه‌یه ته‌نیا رووالە‌تیان یه‌ك بێت
ئاڵ‌وكۆڕ ـ جووته ناوه‌و له ره‌كی چاوكی ئالآن‌و گۆڕین
پێكهاتووه .

(٤) ئالآن ـ چاوگه‌و كۆی ( ئاڵ ) ـه‌و ناوی داستانێكی
ناسراوه كه ( مه‌می‌ئالآن ) ـه .

(٥) ئالآ . بناغه‌ی چاوگه‌و ناویشه ، ده‌گوترێت ئالآكردنه‌وه ـ
چاوگی لێكدراو ـ به‌واتای له یه‌ك جوداكردنه‌وه ، یان
سكالآی كرد ـ كه له سێ ئالآ كردنه‌وه پێكهاتووه ـ
به‌واتای رازو گله‌یی كردن ، كردنه‌وه‌و ده‌رخستنی شتی
ناو ده‌روون ، هه‌روه‌ها گه‌لێك تێبینی‌ی تریشمان هه‌یه
ده‌رباره‌ی ئالآن‌و ئالآو ئاڵ لێره‌دا جێگه‌ی باس كردن
نی‌یه ، به‌ڵكو له‌و باسه‌دا كه ده‌رباره‌ی وشه‌و دروست
بوون‌و داتاشین‌و دراشتنی وشه‌یه بۆ جۆره‌ها مه‌به‌ست
ئه‌مانه روونده‌كه‌ینه‌وه . ئه‌مه ته‌نیا بۆ سه‌رنج راكێشانه .

(٦) بەڵکە بۆ ناسینی نیشانەی چاوگ یان پیتی پێش نوونی چاوگەکە گۆڕینیەوەی فرمانەکەیە بۆ کاتی رابوردوو ، چونکە بناغەی ئەم کاتە تەنیا بە لادانی نوونی چاوگ پێک دێت ، واتە ئەو پیتی پێش نوونی چاوگە لەو بناغەیەدا دەمێنیتەوە وە بەو پیتە چاوگەکە دەناسرێت ، بۆیە دەتوانین بیدۆزینەوە یان راستی بکەینەوە ئەگەر بە هەڵە بەکارهاتبوو . هەروەها بە یاریدی پاشکری (وە ـ ڤە) کە یەکسەرو بە بێ دەستکاری دەچیتە کۆتایی چاوگەکەو دەلکیت بە نوونی چاوگەکەوە .

(٧) مەرج نی یە هەر چاوگێك کۆتایی بە نیشانەی چاوگ هاتبیتو بە تەنیا بەکار نەهیت ئەو چاوگە هەبووەو واتادارا بووەو ئیستا واتاکەی نەماوە بەڵکو بە شێك لەمانە بەتالیەتی ئەوانەی رەگەکانیان راستو رەوان لەگەڵ ناوێك یان ئاوەڵناوێك یەك‌دەگرنەوە لە رووالەتو لە واتادا ، ئەمە وای دەردەخات کە ئەم ناوو ئاوەڵناوانە ئەنجامی پێویستیو لە کاتی جیاواز جیاوازدا بوون بە چاوگو فرمان چونکە رەگەکانیان بە بێ دەستکاریو گوڕران لە فۆرم ناوەرۆکدا ماونەتەوە ـ بەلام ئەو نیشانەی چاوگە یان نوونی چاوگ کە کردوونی بە چاوگ نەی توانیوە وەك خۆی واتاکەی بپارێزێت یان لە قسەکردندا بۆ مرۆڤ نایێت بەکاری بهێنێت ـ بۆیە پێشگرو پاشکر ئەم دەورە

دەبینن ـ کـە ئەمەش دووبارە گرنگی پێشکرو پاشکر دەردەخات ، سەرەڕای دەرخستنی ڕێگەی پەرەسەندن و ئەو ئالوگۆڕانەی بەسەر وشـــەدا دێت بۆ پڕکردنەوەی بەبەستە نوێکانی زمان کە لە ئەنجامی پێشکەتنی کۆمەڵدا بەدیار دەکەوێت .

(٨) فەرهەنگی مەهاباد . گیومۆکریانی .

(٩) ئەگەر سـ‍ـــەرنجی ( شیر ) بدەین کاتی تێکچوونی لەگەڵ شێوەی هـەور کاتی ڕەوینەوەی دەبینین زۆر لەیەکەوە نیزیکن بۆیە ( مجازاً ) بۆی بەکارهێنراوە . زمانەکەشمان پڕە لەم نموونانە .

(١٠) فەرهەنگی خال . بەرگی یەکەم . ل : ١١٥ .

(١١) چاوبڕکێ . بۆ ئەوە بەکاردێت کە یەکێك چاوی لە یەکێك بڕیبێت و سەرەنانکێی لەگەڵدا بکات ، واتە یەك لەسەر یەك پچڕپچڕ سەیری ئەو کەسە بکات ، بەڵام پێکهاتووە نەك لە ( بڕك ) بەڵکو لە ( چاو ) + ڕەگی چاوگی ( بڕین ـ بڕ ) + پاشکری ( کێ ) ، چاو بڕکێ سەیرکردنێکی درێژو بەردەوام نی یە بەڵکو کورت کورت و بڕاوە ، لەوانەشە پەیوەندی لە نێوانی ( بڕ ـ کێ ) و ( بڕ ـ ك ) دا هەبێت واتە : بڕین و بڕکان ... هەروەها دەرکەوت کە ( کێ ) پاشکرەو نموونەش زۆرە بۆی وەك ـ چاوشارکێ : چاو + شار ( ڕەگی چاوگی شاردن و

شاردنەوەو رەگی فرمانەکەشە ) + پاشکری ( کێ ـ ke )
یان : ـ حەماموکێ ـ حەمام ـ ۆ ـ کێ . ( ناوی یاری‌ی منداڵانە ) ، یان : هەناسە برکێ : هەناسە + بڕ ( رەگی چاوگ و فرمانی برین ) + کێ . کە جۆرە نەخۆشی یەکە یان ئەنجامی راکردن و ماندوو ـ بوون مرۆڤ هەناسە برکێی تووش دەبێت واتە هەناسەی سواری یەك دەبێت هتد . . .

یان ـ تا چاو بڕبکات هەر شینایی‌یە ، واتە ـ تا چاو توانای بینینی هەبێت . ( بۆ درێژبی ماوەو شوێن .
ئەمانەمان هێنایەوە بۆ ئەوەی وورد بین لە بەراوردی و ساغ کردنەوەو جوداکردنەوەدا ، یان گەڕاندنەوەیان بۆ سەر یەك .

(١٢) بۆ ئەمانە بڕوانە ـ فەرهەنگی خاڵ ـ بەرگی یەکەم . ل : ١١٥ .

(١٣) هەندێك جار ئەم چاوگە وەك هەر چاوگێکی دیکەی واتادار بەتەنیا بەکاردێت ، واتە دەگوترێت ـ شیرەکە هەڵبزڕکا ـ یان ـ شیرەکە بزرکا ، یان ـ هەڵپرووکان و پڕووکان ، هەروەها ئەم چاوگانە شوێن تا شوێن و ناوچە تا ناوچە دەگۆڕێن ، لەوانەیە بەشێك لەمانە لەشوێنێکدا سەربەخۆبن لە شوێنێکی تر بەتەنیاو بێ پاشکرو پێشکر بەکارنەهێن ، یان بە هەردوو جۆر بەکاردێن ، ئەمەش

پێویستی‌ی بەسەرنجدانو گەڕانو ووردبوونەوە هەیە . بۆ نموونە : - رەوین ( رەڤین - ) لە شێوەی ژوو - روودا بەواتای - راکردنو هەڵهاتن ، لە شێوەی خوارووا بەم جۆرە بۆ ئەم مەبەستە بەکار نایێت بەڵکو لەگەڵ پاشگری ( وە ) دا بۆ مەبەستێکی نوێی نیزیك لە مەبەستی ( رەڤین )وە بەکار دەهێنرێت ، وەك : دەنگە دەنگ مەکەن با خەوی منداڵەکە نەرەوێتەوە . رەوینەوە ( رەڤینەوە ) - زوێشتنی خەو .

هەروەها ئەم چاوگە ( هەڵبزرکان ) ، لەبەر ئەوەی واتای تێك‌چوونو پچرپچری دەدات ، بۆ تێك چوونی رەنگو رووالەتیش بەکاردێت وەك : رەنگی باش هە - ڵبزرکاوە : ئەنجامی ماندوویی ، یان نەخۆشی ، یان - ترس . هەروەها بۆ مرۆڤێك نەخۆش بێتو ووڕێنە بکات واتە قسەی پچرپچر کە هیچی بەسەر هێچەوە نەبێت دەگوترێت : دەبزرکێنێت ، یان : بۆ کەسێك بیر لە قسە نەکاتەوەو قسەی ناتەواو بکات بەکاردە هێنێت .

(١٤) بزکانو برسکان - یان - برزکان - لەیەکەوە نیزیکن لە رووالەتو واتادا تەنیا ئەوەندە نەبێت پێق ( ز ) و ( ڕ ) ی پاشو پێش خراون کە ئەمەش لە هەموو زمانێکدا هەیەو لە زمانی کوردیش‌دا بەم جۆرە بۆ نموونە کن - نك ، مێرووله - مێلووره ، پشقل - قشپل هتد ..

(١٥) بۆران ـ ناوه ـ بەواتای : بای توند ، باوبۆران ، له رووالەتدا له ( بووران ) ەوه نیزیکه ، هەروەها ( بوورانەوه ) و بورن‌و بواردن . پێویستی‌یان به لێکۆڵینەـ وەیەکی باشەو ئێمه تارادەیەك ئەم هەوڵەمان داوەو ئەم رێکەیەشمان بۆ قوتابیەکانمان روون کردۆتەوه ، لێرەدا ئەم باسە زۆر دەکێشێت بۆیه تەنیا بۆ سەرنج ئەمەمان گوت‌و بۆ جارێکی ترو هەر لەم باسەدا گشت ئەمانه دەنووسین .

(١٦) بەرای ئێمه ـ رەگی بێژان‌و بێژین‌و بێژانەوەو دابێژان‌و بێژنگه ، چونکه هەموویان یەك واتایان هەیه له بنجدا ، ئەویش تەتەڵه کردن‌و گەلاڵەکردن‌و پاككردنەوەیه ، بۆ نموونه : شت بێژانەوه ـ یان ـ دابێژان . ( بێژین ) بەواتای ئاخافتن‌و قسەکردن ، کە پوختەو رێك خستنی مەبەست دەگرێتەوه له مێشكدا واته بێژانەوەی پێش دەربڕینی له رێی قسەکردن‌و زمانەوه ، ئەمەشی بەڵگەـ یێکی تره لەو بەڵگانەی زمان کە دە لێت . . زوربەی وشەکان لەیەکتری وەردەگیرێن بۆ دەیەها مەبەستی وورد کە به ئاسانی دەرەناکەوێت بۆ مروڤ .

(١٧) بێژنگ ـ پاشگری ( نگ ـ *nig* ) یەکێکه لەو پاشگرە گرنگانەی به دوای دەیەها وشەوه دەلکێت بۆ گەیاندنی جورەها مەبەست‌و واتای نوێ سەرەرای دروستکردنی

وشەی تازە ، لیرەدا ئەم پاشگرە چۆتە سەر رەگی فرمانو چاوگەکەو بووە بە ناو بۆ جێبەجێ کرونی کارەکە . ئەم رەگانە لەگەڵ پێشگرو پاشگرا دەورێکی باشی دەنوێنن لەزماندا کە بەراستی شایانی هەوڵو تەقەلایێکی شارە- - زیانەی باشن .

(١٨) پاشگری ( ئاندن ) بە بێ هیچ جیاوازییەك لە چاوگی تر تینەپەری ئەم چاوگانە بەگوێرەی پێویستی دەکات بە تیپەرو دوا بەدوای بناغەی فرمانەکە دێتو هەمیشە پاشگری (وە) دەخاتە دوای خۆیەوە .

(١٩) بـەڵگەش بۆ ئەمە کـــە چاوگێکی ( یائی ) یە - بـە گۆرینەوەی فرمانەکەی بۆ کاتی رابوردوو دەردەکـەوێت پیتی پێش نوونەکە ( ی ) یە یان پیتێکی کەیە .

(٢٠) بەش - بەشێك - ناوە بە واتای نەخشێك - بەشینەوە - دابەش کردن : یەك واتایان هەیە ، ئەمە دەری دەخات کە ئـەم ناوو ناوەڵناوو وشەی ترانە - بەگوێرەی پێویستی دەبنو بوون بە چاوگو فرمانو دەچنە پاڵ چاوگو فرمانەکانی تری زمانەکەمان ، یان بە وەرگرتنی نیشانەی چاوگ بوون بە چاوگی سادە ، یان بە چوونە پاڵ چاوگێك وەك خۆی بوون بە چاوگی لێکدراو لەگەڵ چاوگەکەدا یان بە هەردوو شێوەو بوون بە دروست کراویش بە یاریدەی پاشگرو پێشگر . بروانە هەمان نموونەو ئەو نموونانەی لەم

جۆرەن .

(٣١) بریسکە ـ ناوە بۆ رووناکییەکی تایبەتی کە دێت و دەڕوات بریسکان لەمەوە وەرگیراوە ،هەروەها لە کوردیدا برووسکە هەیە بۆ هەمان واتا ـ تەنیا جیاوازی ئەوەندەیە ـ پیتی بزوێنی یەکەم ( ی ) یەو لە دووەمدا ( وو ) وە لە هەمان کاتدا ( بجازاً ) کورد دەڵێت : برووسکە لە سنگمەوە هات . بروسکە بە سنگمدا دێت و دەروات . لێرەدا مەبەست نەك رووناکی یە بەڵکو ( ئازارێکی تیژی پچرپچرە لـە ناکاو دێت ودەروات ، بسکەی سمیلیش کاتی بەکارهێنانی لە شوێنی خۆیدا بەلای ئێمەوە پەیوەندی ی بەمەوە هەیـە کەم بێت یان زۆر .

(١٢٢) بریق ـ کە رەنگی چاوکی ـ بریقان ـ ەو لە هەمان کاتیشدا ناوە . بریقە بۆ رووناکی و شەوقدانەوە ، وەك ـ بریسکەو برووسکەو درەوشانەوە ، واتە هەر وەك ناوی رەنگ زۆرە ناوی رووناکیش زۆرە لـەم زمانەدا ، لـە هەمان کاتدا وەك جووتە ناویش ـ دوو بەدوو بەکاردێن بۆ مەبەستی تایبەتی ، وە ئەوانەی دوو بەدوو بـەکاردێن زۆرن بەتایبەتی کە بە دووبارە کردنـەوەی هەمان وشە دەبێت ، لەمانە ناوی دەنگی سروشتی لە زمانی کوردیدا ئەمەش وەك باسێك بەم زووانە بڵاو دەکرێتەوە .

هەروەها لـــە عەرەبیدا ـ بریق ـ بەکاردێت بۆ

هەمان مەبەستو ( برق ) بۆ برووسکـە وەك کوردی ، بەرقو بەریق ( برق وبریق ) لە ووالەتو واتادا زۆر لە ( بریق ) و ( بریقانەوە ) دەچێتو لەوانەشە یەك بن.

(٢٣) پرووکانو پرووزان وسووتان هند . . . ئەمانـــە ناوو فرمانی تایبەتین بۆ سووتانو جۆرەکانی سووتان وەك ناوی رووناکی بۆ لەیەکدی جودا کردنەوە ، ئەمەش وردیو پێشکەوتنی زمان دەردەخاتو پێویستی بە لێکۆلینەوەیە .

(٢٤) پرووسقانووا پرووسقان کە داررووتان وقرسنەوە دەکەیێنێتو رەگەکەی ( پرووسق ) ـە ـ وا دیارە کە پەیوەندی لە نێوانی ( پرووسق ) و ( پرووسك ) دا هەیە لەوانەیە هەر یەك بن ـ جیاوازییان لە رووالەتدا تەنیا لە پیق ( ق ) و ( ك ) یەو لە واتادا بۆ زل کردن یان نرخ دان یان سەرنج راکێشان بۆ شتێك ( مجازاً ) بەکار دەهێنرێت ، واتە داررووتاندنی شتێك کە هیچی پێوە ئەمێنێت بە جۆرێك تا دە بریقێتەوە .

(٢٥) بەشێك لەم چارگانە وەك لەسەرەوە گوتمان نـاوچە تا ناوچە دەگۆرێن ، ئەمەشی بەم جۆرە جار هەیە بەتەنیا بەکار دێتو جار هەیە بەتەنیا بەکار ، ناهێت ، لەوانەشە نەك بێ واتایی هۆی ئەمـە بێت بەلکو فەراموش کردنی ووشەکەیە ئەنجامی بەکار هێنانی لەگەل پێشکرو پاشکر تا بەرە بەرە دەچێتە شێوەی ئەوانەی بەتەنیا بەکـار نایێن

یان واتایان نی‌یە ، ئەمەشی زیان دەگەیێنێت چونکە کوێر بوونەوەی وشەو گۆڕینی ئەنجامی پشت گوێ خستن شتێکەو ئەنجامی پێشکەوتن‌و پەرەسەندنی زمان شتێکی ترە ، نموونەشمان لەمانە ئەوەندە بەدەستەوە هەیە کە بیخەینە شێوەی باسێك‌و بڵاوی بکەینەوە ، لێرەدا بۆ سەرنج راکێشان ئەوەند دەڵێین‌و لە شوێنێکی ترو لە نموونەکانی دیکەی ئەم باسەدا بۆ روون بوونەوەی زیاتر دێینەوە سەری .

(٢٦) چاولێ پۆشین ـ بە ( مجاز ) بەکار دەهێنرێت لەم زمانەدا بە هۆی پەیوەندیی نێوانی مەبەست‌و واتای وشەکەو شوێنی بەکار هێنانی .

(٢٧) پۆشی ـ کە بناغەی چاوگە لە هەمان کات‌دا وەك ، ناو بۆ روو پۆش لە عەرەبی‌دا بەکار دێت ـ پوشی ( پووشی ) پۆشی‌و پووشی رەگی چاوگەو فرمانی ( پۆشین‌و پوشیدن ) لە کوردی‌و فارسی‌دا واتە فرمانێکی ئێرانی‌یە ، یان وشەییکە سەر بە بنەماڵەی زمانەکانی لقی ئێران .

(٢٨) پۆشتە ـ پێکهاتووە لە رەگی چاوگ‌و فرمان ، پۆش + پاشگری ( تە ـ ) = پۆشتە بووە بە ناوو ناوی فرمان بە واتای هەبوون ، بە پێچەوانەی رووت وقووتی ، لێرەدا ( تە ) پاشگرەو دەچێتە پاڵ پاشگرەکانی تری ئەم زمانە بەڵام وەك دیارە کەم بەکار دێت بۆ نموونە : رەق ـ رەقیتە : رەق + ی + تە . کە ناوە بۆ نەخۆشییەك لە سەرماوە

تووشی مرۆڤ دێت ایرەدا ئەم پاشکرە چۆتە سەر ئاوەـ
ڵناوو ناوی دروست کردووە .

(٢٩) پلۆخ ـ کە رەگی چاوگی ( پلۆخان ) ە کە بەدیو خراپەی
برین نیشان دەدات چونکە کە دەگوترێت دەمی داپلۆخاوە
واتە برینی ناو دەمی پیس وخراپە واتە خراپ بووە بە
برین ، لە زمانی رووسیدا پلۆخە ـ ) ئاوەڵناوە
بەواتای بەد ، خراپ بڕوانە پەیوەندیی نێوانی هەردووکیان
لە واتاو رووالەتدا .

(٣٠) هەڵپاچین ـ چاوگەو هەڵپاچان بە گیایەك دەگوترێت گوڵی
سوور بێتو بە زۆری لە قەدی گردی سوورك سەوز دەبێت
لەوانەیە ناوی گردە کە لە ناوی رەنگی گوڵەکەوە وەرگیراـ
بێت ـ ئەم گیایە ووشك دەکەنەوەو دوایی بۆ دەرمان کردنی
زام بەکاری دەهێنن ) بەم جۆرە بیستوومانە .

(٣١) پاچینە ـ کە ناوە بۆ جۆرە یاری یەك پێی دەگوترێت
(پەلیکانێ) ش ، پێکهاتووە لە : پاچ + ی ( پیق ) پەیوەندە +
پاشکری ( نە ) ، ئەم (نە) یە پاشکرێکی ترە لە زمانی
کوردیدا کە دەچێتە سەر ناوو ئاوەڵناو بۆ دروست کردنی
ناوو واتای تازە بۆ نموونە : ـ زەرد ـ زەردێنە ، سپی ـ
سپێنە ، زەردێنەی هێلکەو سپێنەی چاو ، یان : نیسك
نیسکێنە .

(٣٢) پاچوولکە : ناوی بچووك کراوە ، بە یارمەتی پاشکری

( لکه ) پێکهاتووه ، ئەم پاشکره یەکێکه لەو پاشکرانەی ناوی بچووك کراوو ناوی نوێ دروست دەکەن بۆ نموونه پاچ + وو + لکه . بچووك کراو ، داس ـ داسوولکه ـ ناوی بچووك کراو ، چاو ـ چاویلکه ناوی تازه ، پێپیلکه ناوی تازەیه هند . . .

(٣٣) بڕوانه ژماره : ١٣ سیانزه ـ که دووباره وەك پلۆسکان رووتانەوەو قۆستنەوە دەکەیێنێت ، دیاره هەردووکیان یەکن بەڵام هەندێك جار بەگوێرەی ناوچه رووالەتیان گۆڕینی بەسەردا دێت .

(٣٤) پلۆسك که رەگی چاوگی ( پلۆسکان ) ە که واتای رووتیو هیچ پێوه نەمان دەگرێتەوه ، له واتاو رووالەتی ( پلووسك ) ـ ەوه نیزیکه که ناوه بۆ شتێکی ناو بۆش و بەتاڵ ـ که دروست دەکرێت یان دروست کراو ناوی تێدا دەخورێتەوه ، پلوسك ـ دوو باره ناوه ـ بەواتای ـ شمشاڵ پلوور ، بلوێر . پێویستی بەلێکۆلینەوەی زیاتره لێرەدا ماوه هەرئەوەندەیه .

(٣٥) بێگومان پەیوەندی لەنێوانی ـ پسك ـ کەزی ـ که ناوه لەگەڵ ـ پسك ـ که رەگی چاوگ ـ پسکان ـ ە ـ هەیه له واتاشدا نەك تەنیا له رووالەتدا . سەرنج بده .

(٣٦) پەس ـ که رەگی چاوگی ( پەستن ) ە ـ نیزیکه له ـ باس ـ که رەگی چاوکه له زمانی تورکیدا بۆ هەمان

مەبەست و واتا - هەروەها - پەستن - لە چاوگی - باسماغ وە کە شێلان و ڕەنگ پێ هەلچنین دەگرێتەوە نیزیکە .

(٣٧) ( پرخان ) مان - لێرەدا هێناوەتەوە نەك بۆ ئەوەی بیخەینە ریزی چاوگی بێ واتا بەڵکو بۆ ئەوەی دەری بخەین کە ناوی دەنگەو - ناوی دەنگ - بەتایبەتی - دەنگە سروشتی یەکان - دەکرێن - بە چاوگ و فرمان - بەڵام تێنەپەر بەیاریدەی پاشگری ( اندن ) - بۆیە نابێت لەگەڵ ئەمانەدا تێکەڵ بکرێت بەڵکو بەتەنیاو بەووردی پێویستی بەباس و لێکۆڵینەوەیە . کە هیوادارین بەم زووانە بە چاپ کراوی بکەوێتە بەردەستی خوێنەر . لێرەدا ئەم چاوگە - ژمارەی تایبەتی ی بۆ دانە نراوە لەبەر ئەو هۆیەی سەرەوە .

(٣٨) بەرای ئێمەو تا ئیستا وا دەردوکەوێت - کە - پرژ - و - پرش - یەکن لە رووالەت و لە واتادا - کە - بلاوبوونەوە دەگەیەنن - ئاوە کە دەپرژێنیت - بلاوی دەکاتەوە پرشنگ دەهاوێت - پرش - رووناکی بلاودەکانەوە - یان - پرشنگی لێ دەبیتەوە . پرش و بلاو بۆوە . پرش و بلاو - جووتە ناون یەك واتایان هەیە . هەروەها پرش - بەواتای تیشك - شەوق - رووناکی - کە بە تەبیعەت بەم لاو بەولاو بە دەوروپشتی خۆیدا بلاوە دەبیتەوە .

پرش + پاشگری - نگ = پرشنگ - ناوە - بروانە - باسی پاشگری ( نگ ) لەم پاشکۆیانەدا وەك

پێشتریش گوتومانە ـ تەنیا ئەوەندە دەربارەی ئەم وشانە دەڵێین بەڵام وەك پاسێك بەتەنیا ـ لەم وشانە دەكۆڵینەوە كاتی خۆیو بەشێوەیەكی فراوانترو بەنموونەوە .

(٣٩) لە كوردیدا ـ هەڵپرواندن ـ وەك گوتمان ـ بۆ دانە دانە كردنی شت بەكاردێت وەك : ـ مێوە ـ كە بكونجێت وای لێ بكرێت ـ لەمانە ـ هەنار ، ترێ . هتد . . لەوانەیە ئەمە پەیوەندیی لەگەڵ ـ هەپروون ـ هەپروون ـ دا هەبێت كە واتای ووردبوون دەگەیێنێت كاتی شكاندنی شتو وردبوونیو جوداكردنە وەی ئەو بەشە شكاوانە لەیەكو شكاندنیان بە جۆرێكی وورد ، یان لەوانەیە ـ تەنیا لەواتادا نزیك بن لەیەكەوە .

(٤٠) تەك رەگی چاوگی تەكینە ـ تەك ـ لە توركیدا بەواتای تاك تەینا بەكاردێت لەیەكەوە نیزیكن بەڵكو یەكن .

(٤١) تەكان ـ تەكانی دایەخۆی ، تەك + پاشكری ( ئان ـ ) = تەكان ناوی فرمانە لە رەگی چاوگێو پاشكری ( ئان ) دروست بووە ، ئەم پاشكری ( ئان ) ەش دەوری هەیە لە دروست كردنی گەلێك وشەو واتای تازە ، هەروەها ناوی فرمانیش دروست دەكات وەك : ـ تەكین ـ چاوگێ تەكان ناوی فرمان ، بارین ـ چاوگەو باران ناوی فرمانە هتد . . .

(٤٢) تكان ـ دووبارە ئەم چاوگە لەو چاوگانەیە كـە نیشانەی

جووڵەیان تێدایە وەك : ـ ناو لـــە مەنجەڵەكە دەتكێت ( تكان لە ) بۆیە بووە بە لێتكان . تك كە ڕەگی چاوگی تكانە وەك ناو بەواتای تنۆك یان قـــەترە ( قطره ـ لە عەرەبی دا ) كە نێزیكە لە دلۆپەوە ( دلۆپەو drop ) ی ئنگلیزی لە واتاو ڕووالەت زۆر نیزیكن بیگومان لە یەك بنج پێكهاتوون .

(٤٣) پەیوەندی ی نێوانیان ئاشكرایە كە بچووكی یەو هەردووكیان یەكن لێرەدا ( مجازاً ) وەرگیراوەو بەكار هێنراوە .

(٤٤) تووتە ـ تووتك . ناوی بچووك كراوەو وشەیەكی نوی یە لە واتادا ، بە یاریدەی پاشكری (ك ـ ) دروست بووە وەك ـ دڕ ـ دڕك ، لانە ـ لانك ، دانە ـ دەنكە . ناو ناوك چاو ـ چاوك ، ئەن ( توركی یە ) ئەنك ، زەرد ـ زەردك ( زەردێنە ) هتد . . .

(٤٥) پێویستە ـ تێزان ـ لەگەل زایین بەراوردی بكرێت چونكە ڕووالەتو واتایان زۆر لەیەكەوە نیزیكـــە ، هەروەها پێویستە لەگەڵ ( زایین ) و ( تیزان ) یش دا ، چونكە ( زانین ) پڕ بوونو زۆر بوونی شارەزایی یەو هەموویان ( زان ) كۆیان دەكاتەوە ، هەروەها لەگەڵ ( زن ـ زنا ) كە ڕەگی چاوگی ( زنات ) ی ڕووسی یەو واتای زانینە .

(٤٦) بەڵگەمان بۆ ئەوەی كە ( تێ ) پێشگرەو بەشێك نی یە لە چاوگێو فرمانەكە ، جودا بوونە وەیەتی لە فرمانە كە بە

گۆڕینەوەی بۆ کانی ئێستا ، وەك خوێن ئێزان . خوێنی تێ ـ دە ـ زێ . ئەمەش بنکەیێکی کشتیە بۆ ناسینو جودا کردنەوەی پێشگر لە پیتە بنجییەکانی وشە بە تایبەتی چاوگو فرمان .

٤٧ ـ بڕوانە پەراوێزی ژمارە ـ ٤٧ .

٤٨ ـ هەندێك جار ـ پێشگرو پاشگر دەچنە سەر چاوگو فرمان بۆ بوون بەهاوەمەبەست نەك گۆڕینی واتا ـ وەك : تریقەین ـ شیوەی ژووروو ، تریقانەوە ـ شێوەی خواروو ئەم دووانە یەکنو هاوبەستنو بەدوو جۆر بەکاردێنو بەتەنیا بە پاشگریشەوە، نموونەش ـزۆرەـ بەسەر نجدانی نموونەکان بۆتان دەردەکەوێت .

٤٩ ـ تەریق بوونەوە ـ یان تریق بوونەوە ـ مجازا ـ لە ـ تریقانە ـ وەو تریقین وەرگیراوە بۆ ئەو گۆڕانە بەکاردێت کە بەسەرو چاوی مرۆڤدا دێتو لەگەڵ زەردەخەنەیەك یان پێکەنینیك نەك راست بیت بەڵکو ئەنجامی ترسیو خەجاڵەت ـ بوونو شەرمەزاری . پەیوەندیش لە نیوانی هەردوولادا ئاشکرایە ، بۆیە وەرگیراوە بۆ ئەم مەستە .

٥٠ ـ جووتە ناوەو بۆ جۆرە پیکەنینیك ـیان ـ دەربڕینی خۆشی بەکاردێت پیکەنین، خەنین، زەردەخەنین، تریقانەو،قاقاو پیکەنین هەروەك جۆرەها ناو هەیە بۆ رووناکی ، ترسی ، دەنگ ئەمانە لە باسیکدا کۆدەکەینەوە .

٥١ ـ هیچ مەرج نىیە تێنەپەڕ هەبێت بە بوونی تێپەڕ بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی فرمانو چۆنیەتی رووداني، یان لەبەر ئەوەی ( ئاندن ) کردوویەتی بەتێپەڕ، بەڵکو لەوانەیە ـ ئەمە ـ چاوگێکی تازە بێتو لە ناوێك دروست بووبێتو یەکسەر بەیاریدەی ( ئاندن )و بوو ـ شبێت بە تێپەڕ لەبەر سروشتی کارەکە .

٥٢ ـ ( ئاران ) ناوەو ناوی پایتەختی ( ئێران )ە .

٥٣ ـ ( تەو ) لەوە دەچێت کە ناوەکە ناوی دەنگ بێتو ئەم ناوی دەنگە بە یاریدەی ( ئاندن ) بووە بە چاوگ چاوگی تێنەپەریش وەك ناوی دەنگەکانی دیکە . هەروەها لە زمانی عەرەبیدا ـ تەو ـ وەك ناوی دەنگ بەکاردێت یان ـ (تەوتەو) بەم جۆرەش ـ (تەم- تەم) ( تمتمە )ش لە عەرەبیدا دیارە .

٥٤ ـ لێرەدا ـ تەمران ـ نىیە ـ تەمراندن هەیەو چاوگەکە تێپەڕەو یەکسەر ( ئاندن )ی چۆتە سەرو بووە بە تێپەڕ خۆشی ـ لە ـ ( طمر )ی عەرەبیو پاشگری ( ئاندن ) پێك هاتووە لە شێوەی ژووروودا بە واتای ( گوژاندنەوە) بەکاردێت .

(٣٥) لەوانەیە ـ چەنە ـ چەناکە ـ هـــەر ـ رەگی چاوگی چەنین بێت یان بەپێچەوانە ـ چـەنە بووبێت بە چاوگ باش هەبوونی وەك ناویش . چونکە چەناکە ـ یان ـ چەنە ـ ناوە ـ بۆ کاکیلەی خوارەوە کە دەوجوولێتەوەو چەنین ـ و ـ راچەنین ـ یش جوولەییکە کـاتی ترس لەش و دەم و چاوو چەناکە دەکرێتەوە بەتایبەتی دەم کردنەوە کە بەجوولاندنی چەناکە دەکرێتەوە .

(٥٦) ئەگەو ســـەرنجی نموونەکانی ئەم باسەبدەین ـ ئەو نموونانەی ـ کە دەنگ و کاردەکرنەوە ـ دەبینین جار هەیە ( مجازاً ) وەك دەنگ بۆ دەنگی شتی تر بەکاردێن یان وەك جوولەو کار وەردەگیرێن بەگوێرەی پێویستی ، بۆیە پێویستە سەرنجی ئەمانە بدرێت بەووروی و تێکەڵ ـ نەکرێن لەو شوێنانەدا ، چونکە مەرج نییە وشە کە وەرگیرا بۆ مەبەستێك بەگشتی وەربگیرێت بەڵکو هەر وشەیە واتای گشتی و یان چەند واتایەك دەبەخشێت جا دە گونجێت بۆ یەکێك لەو مەبەستانە وەربگیرێت .

(٥٧) لەوانەیە پەیوەندی لە نێوانی ـ چزان ( چز )و ( چووزان ـ چووز ) و ( چزوو ) ی زەردەـاڵەو دووپشك و شتی تردا هەبێت ـ کە هەموویان لە رووالەت و لە واتادا زۆر لەیەکەوە نیزیکن . بۆ سەرنج راکیشانی خوێنەر .

(٥٨) چکان چاوگەو ( چکاندەرە ) ناوی جۆرە یاری یەکە .

(٥٩) ئەم چاوگە لیرەدا بەیاریدەی پاشگری ( وە ) جاریک ، جاریکیش بەیاریدەی پیشگری ( وە ) بۆهەمان مەبەست بەکارهینراوە ، ئەم ( وە ) یە بە کویرەی شوینی بەکارهینانی جودادەکریتەوە پیشگرە یان پلشگر زۆر جار وەك لیرەدا هیچ کارناکاتە سەر واتا ، هەندیك جار وەك لە شیوەی ژووروودا دەردەکەویت بۆ دووبارە کردنەوەی کارە .

(٦٠) لەوانەیە ـ حەلان ـ حلان ـ لیرەدا هەر ـ هیلان ـ ە کە بیت ، وەك نیزیکی رووالەتو واتـای هەردوکیان دەری دەخات .

(٦١) خەنین ـ لەو چاوکانەیە ـ کە بەتەنیاو وەك چاوکیکی سەربەخۆ ـ لە شیوەی خواروردا بەکارنایبت ، بەلام لە شیوەی ژووروودا و هەندیك ناوچەی تر بەکاردیت .

(٦٢) ئەمە لەو وشانەن کە ئیستا رەگەکانیان دیارە ، واتە ئەو رەگانە ماونەتەوە وەك خویانو بەتەنیاو وەك چاوگ بۆ هەمان مەبەست بەکاردین ، هەر وەك هەیە نەماوە ئەمە لە لایەکەوە کۆنیو تازەیی دەکەینیت لە لایەکی ترەوە مەرج نییە ، بەلکو پیویستی بەو وشانە لە ژیاندا هۆی مانەوەو بەردەوامییانە کە بەستراوەتە بەژیانەوەو هەمیشە دەبیتو روودەدات .

(٦٣) وەك : تەمراندن ـ کە لە ـ طمر ـ ەوە وەرگیراوە وەك دەر دەکـەویت ( خەلەتـاندن ) یش لە ـ غلط ـ ەوە

وەرگیراوە لەوانەشە بە پێچەوانە بێت - هەرچەندە لە هەڵەوە نیزیکن ،

(٦٤) ئەمەیان لە - خورپ + پاشگری ( -ە ) پێکهاتووە یان ئەگەر ناوی دەنگیش بێت ئەوە بنجی یە ، چونکە خورپە لە دڵەوە هات بەواتای وەك - دڵم کەوتە خوارەوە - ئازاری تیدایە بەدەنگەوە - واتە ئازار بە دڵم کەوت بەجورێك دەنگی دایەوە . ئەمەو هەرچی لەم چەشنەیە پێویستی ی بە وورد بوونەوەیێکی باشە .

(٦٥) هەندێك جار وەك لەخوارەوە باسمان کردووە - دۆڕان - وەك چاوگیکی واتاداری تینەپەڕ بەکاردێت - بەواتای - فەوتان - لەناوچوون - وەك : دۆڕام ، دەترسم بدۆڕێم .

(٦٦) بڕوانە - گۆڤاری زانیاری کورد - بەرگی یەکەم . بەشی یەکەم . ژمارە یەك . بەغدا . ١٩٧٣ . ل : ٢٣٤ .

(٦٧) - ڕەگی ئەم چاوگەش ئاوەڵناوەو بۆ هەمان مەبەست بەکاردێت . دیارە ئەم ئاوەڵناوە پاشان بووە بە چاوگ وەك ئەوانی تر کە بنجەکانیان ڕوونە ، وەك : پاچ - پاچین ، بەش - بەشین ، لاڵ - لالانەوە هتد ...

(٦٨) ڕەنجبەر - ناوی بکەرو ئاوەڵناوە - لە ڕەنجبردنەوە هاتووە ڕەنج + بە ( ڕەگی فرمانی بردن )ە + پاشگری -ەر - یان : ر - . بە واتای شتبەر کە ( ڕەنج ) -ە لیرەدا . واتە بەپێچەوانە بەکارهاتووە ڕاست

ئەوەیە کە لێرەدا رەنجدەر یان رەنجبراو بەکاربهێت و رەنجبەر بەو کەسە دەگوترێت کە رەنجی رەنجدەران دەبات ، هەر چەندە لە فارسی‌دا ـ رەنجدەر دەگەیێنیت نەك لە کوردی‌دا وانە بەکارهێنانی بەم جۆرە لە کوردی‌دا دیارە لە فارسی‌یەوە وەرگیراوە .

٦٩ ـ رەنگاندن ـ کە چاوگێکی تێپەری دروست کراوە بە یاریدەی پاشکری ( ئاندن ) لە ناوی ـ رەنگ ـ لەو چاوگە تازانەن ـ کە خەریکن دێنە کایەوەو بەگوێرەی پێویستی‌ی‌و لەسەر ئەو بنکانەی لەم زمانەدا هەیە بەبێ کەم‌وزیادی وەوەك هەر چاوگێکی دروست کراو بە یاریدەی ( ئاندن ) ئەو تایبەتیانەیان تیدایە کە بەئاسانی دەردەکەوێت کە ( ئاندن ) چونە سەر ووشەکە .

٧٠ ـ سازان لەو چاوگانەن کە یان بەکارهێنانیان کەم‌بۆتەوە ـ یان ـ هەر ئەوەندە بەکاردێت . چونکە زۆر جار بۆ تەوس دەگوترێت ـ ئەوە چۆن بوو سازای ؟ ئەوە تۆ سازای ؟ سەرسەرمانی تیدا . . وەك چاوەروانی ئــەوە نەکرێت لەو کەسە. چاوگیکی (ئەلفی)یە . . رەگەکەی ـ ( ساز )ە ـ ساز ـ بەکاردێت . وەك : سازکردن دروست کردن‌و ئامادەکردن ـ (چاوگی لیکدراو) ..هەروەها سازبوون ـ چاوگی‌لیکدراوی تینەپەرە ، دان‌ساز ـ ناوی بکەر . تەرەساز ـ تازە سازکراو . هتد . . . لەمەش

پەشیکی باش هەن لەم زمانەدا هەنەیکیان ـ لیرەدا پیش چاوخراون .

٧١ ـ شاردن شاردنەوە . ڤەشارتن ـ ئەمە لەهەردوو شێوەی ژووروو لــــەكـــەڵ خواروودا بـــــەكشتی واتای نی‌یە یان بەبێ پێشكرو پاشكری ( وەـڤە ) بەكارناهیت ، واتە وەك پیشتر باسمان كردووە كە هەندێك لەمانە لە شیوەـ كان‌دا یەكدەكـــرن‌ەوە ـ واتە ـ بەتەنیا بەكارناهینرێت ، هەروەها لەوەش زیـاتر لەهەردوو شیوەكەدا بەیاریدەی هەمان پیشكرو پاشكر بەكاردێت . ئەمەش بەڵكەیەكی بەهێزە بۆ یەكیەتی ئەم شێوانەو پەیوەندییان پێكەوە وەك شێوەو اتی ـ زمان‌و درەمنیك .

٧٢ ـ بكەرپیرەوە بۆ پەراوێزەكانی پێشوو ( پێش + وو )

٧٣ ـ پەیوەندی لەنێوانی ـ هەڵشاخان‌و ـ شاخ ( بەواتای قۆچ ئاشكرایە ، ئەویان توورەبوون‌و ئەمیان كاتی توورەـ بوون‌و شەر كردن بەكاردێت. سەیری پەراوێزەكانی پیشوو بكە

٧٤ ـ شوبهاندن . بەواتای ـ لەیەك‌چوونی دووكەس . یان دوو شت . لە ( شبّه )ی عەرەبی‌یەوە وەرگیراوە. بەلام ـ شوبهەی ـ لیّدەكەم . لە ( اشتبه )ی عەرەبی‌یەوە وەرگیراوە دووبارە ئەم (فعل)ە عەرەبی‌یە چۆتە كوردی‌ـ یەوەو پاشكری ( ئاندن )ی وەرگرتووە . بڕوانە نموونەـ كانی پێشوو .

٧٥ ـ شیان . لە شێوەی ژووروودا ـ بەواتای توانین ـ بەکاردێت
دەشیم . دەتوانم،دەشیین هتد . . ناشیم ـ ناتوانم. نەشیام
نەمتوانی ـ هتد . . لەوانەیە شیان و شایان پەیوەندییان
پێکەوە هەبێت چونکە ـ تارادەیەك لەواناندا نیزیکن
هەروەك رووالەتیان نیزیکە . شایان ـ شایانی باسە ـ لایقە
بەباس کردن ـ دەهێنێت باس بکرێت . قەرناشیت وای
کردبێت گومان و ترس لەم قسەیەدایە ، بەواتای ، قەدنابێت
بێگومان وەك ووشەکانی تری لەم جۆرە پێویستی بە ـ
لێکۆلینەوەیەکی باش هەیە .
٧٦ ـ لەوانەیە . فلق ـ و فلیق و ـ فلقێ ـ یەك بن . فلق کردی
بەژووروا . لەپڕ کردی بەژووردا ـ هەر ئەوەندەت زانی
فلق حازربوو ، لە ناکاو ـ بۆ یەکێك سەربکات بە هەموو
شوێنێکدا بەهەوەسی خۆی و بەرانبەر بۆ نارەزایی دەربڕین
ئەمە بەکاردێنێت. فلقێ ـ وەك جوێن ـ بەکاردێت لە کوردیدا
٧٧ ـ غار ـ وەك ـ ناو بەکاردێت ـ وە چاوگی لێکدراو
دروست دەکات لەگەل چاوگدا : غاردان ـ راکردن ـ
هەلهاتن . لە عەرەبیدا ـ أغار ـ هەیە لەوانەیە
پەیوەندی هەبێت لەنێوانیان .
٧٨ ـ غارغارێن ـ غار + غار + ێن ( پاشگر ) = غارغارێن

ناوی یاری‌یە لە کوردەواری‌دا بۆ واکردن بەکاردێت‌و بەشێکی باش لە یاریەکان بەم جۆرەو بەیاریدەی پاشگری ( ێن ) پێك‌دێت . ئەمەشی وەك پاسێك ئامادەکراوە بۆ بلاوکردنەوە تەنیا بۆ سەرنج‌راکێشان خستمانە پێش‌چاو لێرەدا . بۆنموونەش : تۆپ‌تۆپێن بازبازێن، پەت‌پەتێن، یان یەکسەر دەچێتە سەر ناوەکە وەك : هەلمات هەلماتێن هەلوۆك - هەلووکێن - مونجغ - مونجغێن هتد ...

٧٩ - هەلقولین - قولین وادەردەکەوێت کە ( قولین )و (کولین) یان ( کولان ) یەك‌بن یان‌یەك بنج‌بن چونکە - خواردن بەتایبەتی شتی‌شل کە دەکولیت - هەلدەچێت واتە بەرز-دەبێتەوە ئاوەکە هەلدەقولێ دووبارە بەواتای بەرزدەبێتە-وەو ، بۆ سەرەوە دێت - واتە - هەلقولین - هەلکولین - یەکن ، پێك‌هاتوون لە پێشگری هەل + قولین یان کولین کە رەگی چاوگەکەی ( قول - کول )ی وەك رەگی ( چاوگی - کولان ) ، بەلام نیشانەی چاوگەکە ( ین )ە نەك - ( ئان ) .

٨٠ - قورت لە تورکی‌دا بەواتای - کرم ، قۆرت بەواتای چال هەلقورتاندن بەواتای خۆخستنە ناو شتێکەوە پەیوەندی‌ی بەو کەسەوە نەبێت ، لەوانەیە ئەم دووانە پەیوەندییان پێکەوە هەبێت لەبەر لەیەك‌چوونیان لە رووالەت‌و واتادا

٨١ - قۆستنەوەی ئیستقان ئەوە دەکرێتەوە کە ئێسقانەکە رووت-
بکرێتەوە تا بەتەواوی هیچی پێوە نامێنێت و بریقەدەداتەوەو
ساف‌ولووس دەبێت . رەگی ئەم چاوگە کە ( قۆس )ە
زۆر لە رووالەت و لە واتادا لە وشەی ( قۆز )ەوە نیزیکە
کە بەیەکێك دەگوترێت باش دەست بهێنێت بەخۆیدا ایرەدا
لەوە دەچێت کە رەگی چاوگەکە وەرگیراوە بۆ ئەوەی
بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێترێت یان بەپێچەوانە .

٨٢ - هەلکڕووزان بۆ جۆرە سووتانێك بەکاردێت هەر وەك :
پڕووکان و هەلپڕووکان و سووتان و داپلۆخان و برژان، سووتان
لە سووتان جودا دەکەنەوە ، یان ئەنجامی سووتان
دەردەخەن . یان بۆ شتی جیاواز بەکاردێن وە لەمانەشەوە
سووتانەوەو کرووزانەوەو برژانەوە دروست بووە . ئەمانە
تەنیا بۆ سەرنجراکیشان دەخەینە پێش چاو .

٨٣ - کەنین لەوە چاوگانەیە کە لە شیوەی ژووروودا وەك خۆی
ماوەتەوەو بەتەنیا بەکاردێت ، بەلام لە شێوەی خواروودا
لەگەل پێشکری ( پێ ) نەبێت بەتەنیا بەکارنایێت ،
هەردووکیان بەبێ کەم‌وزۆری یەکن و بوون بە هاومەبەست
ئەمە لەوە دەچێت کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی لەگەل ئەم
پێشکرەدا تێکەل بووەو وەك چاوگێکی بەتەنیا بەکارنەهاتوو
دێتە بەرچاو لەکاتێکدا کە دەردەکەوێت وانی یە، بەلکو
لە شێوەی خواروودا وای لیهاتووە . بەلام لـــە شێوەی

ژوورووودا وەك خۆی ماوەتەوە ، ئەمە دووبارە جیاوازیی نێوانی ئەم شێوانە دەردەخات و ئەوە دەگەیێنێت کە هەر شێوەیەبەگوێرەی پێویستیو زرووفی خۆی گۆڕینی بەسەردا دێت .

٨٤ ـ کەوان ـ لە ( کوی ) عەرەبییەوە هاتووە واتە مەرج نییە ئەم چاوگە وەك چاوگێکی تێپەڕ هەبێت و نیشانەی چاوگەکەشی ( ئان ) بێت ، بەڵکو ، زیاتر ئەوە دەردەکەوێت کە ( فرمان )ە عەرەبییەکە وەرگیراوەو بە یاریدەی پاشگری ( ئاندن ) کراوە بە چاوگێکی تێپەڕی دروست کراو وەك چاوگەکانی تر ، وە بۆیە تێپەڕە چونکە سروشتی فرمانەکە پێویستیی بەوەیە هەر وەك لـە واتاکەیەوە دەردەکەوێت کە ( داغ کردن )ی برینو شوێنی بەئازارە کەوانە ئەم ( کەواندن )ە لێرەدا پەیوەندیی بـەو (کەواندن)ەوە نییە کە تێپەڕی (کەوتن)ەو لە (کەوتن)ەوە وەرگیراوەو بووە بە هاومەبەستی خستن .

٨٥ ـ کڕ ـ لەهەمان کاتدا ئاوەڵناوە بەواتای هێمن ، بێدەنگ کپ ، ( کڕکەوتووەو ئاگای بەسەر دنیاوە نییە ) بۆ مرۆڤی نەخۆش بەکاردێت . یان ـ مریشکەکە کڕکەوتووە کاتی هێلکە کردنو جووجەڵە هەڵهێنان .

٨٦ ـ گۆش ـ رەگی چاوگ و فرمانە + پاشگری ( ش ـ is ) گۆشش ـ ناوی فرمانە ئەم پاشگرە لە فارسیدا زیاتر

بەکاردێت وەك لە کوردی لەوانەیە لە فارسی یەوە هاتبێتە زمانی کوردییەوە ، لەوانەشە پاشکرێکی - ئێرانی - بێت و کەمتر بەکاربێت لە زمانی کوردیدا وەك : پرسش پرس رەگی چاوگ و فرمانی پرسین + پاشکری (ش)، گەردش ، نمایش ، خوایش ( خایش - لە تورکیدا بەکاردێت بەتایبەتی لە (ئازربایجانی)دا بەواتای پارانەوەو تکاکردن ، هەروەها ئەم پاشکرە لە تورکیدا زۆر بەکار- دێت بۆ ناوی بکەرو ناوەڵناوی فرمانی ، وەك : ئوێلماغ مردن ئوێلمش - مردوو ، بناغەی چاوگ + پاشکری ( ش ) ، گۆێرماغ - بینین - دیتن - گوێرمش - دیتە ، گوێرمامش - نەدیتە ، نەدیوبدی : بۆیە بەڕای ئێمە ئەم پاشگرە پێویستی بەلێکۆلینەوەو سەرنجدانە .

٨٧ - گوێز - بە کوردی و ( جۆز ) بە عەرەبی و ( قۆز ) بە تورکی هەرسێکیان یەکن بەڵام کامیان لە کامیان وەرگیراوە؟ هەرچەندە دوورە لەعەرەبییەوە .

٨٨ - لەوانەیە - لاو - کە ناوو ناوەڵناوە بووبێت بە چاوگی لاواندن و لاواندنەوە ، لەبەر ئەوەی - لاو - بەواتای گەنج و ئەم دووچاوگەش بەزۆری بۆ گەنج و لاوو بەتەمەن بچووك بەکاردێت ، لاولاو : ناوی رووەکێکی ناسکی گوڵ جوانە کە هەڵدەچێت بەسەر دیوارو بەرزاییدا ، لە عەرەبیدا ( لبلاب )ە و لەوانەیە هەر ( لاولاو )ە کە بێت چونکە بەکوێرەی زانینی سروشت و شوێنی ئەو رووەکەو

هەرشتێکی دیکە دەردەکەوێت کامیان بنجی‌و کامیان وەگیراوە

٨٩ ـ لاوك بەواتای لاوی بچووك ، لاو + پاشکری ( ك ) ، هەروەها ناوی جۆرە گۆرانی‌یەکی کوردی‌یە ، لاوك ، لاوك‌و حەیران .

٩٠ ـ ( لەر )و لار ـ لە رووالەت‌و واتادا لەیەکەوە نیزیکن ـ لەر ـ لەرانەوە ، جوولانەوە بەم لاو بەو لادا ، لار ـ لاررۆیشتن واتە دووبارە بەم لاو بەو لادا هاتن لەرۆیشتن‌دا یان میزەکە لارە بەواتای خوارە ، یان جێگاکەی لەقەو دەجوولێتەوە .

٩١ ـ قۆستنەوە ، لیستنەوەو خواردن‌و خواردنەوەو مژین‌و هەلمژین‌و هەلنۆشین هتد . . گشت ئەمانە بۆ جۆرەها خواردن‌و شێوەی خواردن بەکاردێت .

٩٢ ـ لە فارسی‌دا ـ بوسیدن ـ بەکاردێت ، لە عەرەبی‌داو لە زمانی خەلك‌دا (بۆسە) بەکاردێت ، لە کوردی‌دا (شێوەی ژووروو ) راموسان ، هەرسێکیان لەیەکەوە نیزیکن .

٩٣ ـ دافرەقان ـ لە ـ فرّق ـ و ـ تفرّق ـ ەوە نیزیکە لەوانەیە هەر ئەو بێت‌و بووبێت بە چاوگێکی کوردیش بەیاریدەی یەکێك لە نیشانەکانی چاوگی ئەم زمانە کە ( ان )ەو لەگەل پێشگری ( دا )دا بەکاردێت .

٩٤ ـ لەوانەیە پەیوەندی بە هێلانج‌ەوە هەبێت ، چونکە واتایان یەکەو رووالەتیان لەیەکەوە نیزیکە .

# ئەنجام

١ ـ مەرج نی یە هەر چاوگێك تێپەڕ بوو پێویستە تێنەپەڕی هەبێت بەتایبەتی ئەگەر چاوگەکە بنجی بوو ، واتە کۆتایی بەیەکێك لە نیشانەکانی چاوگ هاتبوو . وەك : ژماردن کوشتن ، دان ، خواردن هتد. . . هەروەها بەم جۆرەش مەرج نی یە هەر چاوگێکی تێنەپەڕ بەرانبەری تێپەڕ هەبێت وەك ناوی دەنگە سروشتی یەکان پاش بوونیان یان کردنیان بە چاوگی تێنەپەڕ ئەمەش تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی چاوگ و فرمانەکەو شێوەی بەکارهێنانی ، واتە ئەم پێویستی یە تێپەڕو تێنەپەڕ دروستدەکات . ئەمە ئەو چاوگانەش دەگرێتەوە کە تێپەڕن یان تێنەپەڕ ، بەلاّم بەتەنیاو بێ پاشکرو پێشکر بەکارنایێن ، وەك : واسین ـ هەلواسین تێپەڕە کڕووزانەوە ـ تێنەپەڕە هتد...

٢ ـ مەرج نی یە ئەو چاوگانەی بە یاریدەی ( ئاندن ) دروست بوون ، یان بەبێ ( ئاندن ) بەکارنایێن و تێپەڕن دەبێت لە تێنەپەڕەوە وەرگیرابن و ( ئاندن ) کردبێ بە تێپەڕ ، چونکە بەگشتی ( ئاندن ) کە پاشکرێکی فرمانی یە دەچێتە سەر فرمانی ـ عەرەبی ـ ی تێپەڕو یەکسەر دەبێت بە چاوگێکی تێپەڕی کوردی و هەموو تایبەتی یەکی ئەو فرمانانە

وەردەگرێت کە ( ئاندن )یان دەچێتە سەر وەك : طمتر - تەمر + ئاندن = تەمراندن - بەواتای کوژاندنەوە تێپەڕە کوی - کەو + ئاندن = کەواندن ، هەروەهـا مسح - مەسحاندن هتد ... ، جاریش هەیە چاوگەکە فەبێت بە تێنەپەڕ ، یان بە تێنەپەڕی واتا دەبەخشێت بەڵام سروشتی کارەکە ڕێگەی نادات بە تێنەپەڕی بەکار بێت ، یان بە پێچەوانە .

٣ - مەرج نی‌یە هەر چاوگێك بەیاریدەی پاشکر یان پێشگری ( وە ) بەکارهاتوو بێ ئەمە بەکارنەهات دەبێت لـــەو چاوگانە بێت کە واتایان نەماوە واتە هەبوون بەکارهێنراون ماوەیەك .. بەتایبەتی ایرەوا مەبەستمـــان ئەوچاوگ‌و فرمانانەیە کە لەگەڵ ئەم ( وە ) یەدا نەبێت بەکارنایێن بەڵام رەگی چاوگەکانیان- یەکسەر لەرووالەت‌و واتادا لەگەڵ ووشەی تردا- ناو- یان- ئاوەڵناو- یەك دەگرنەوە ، بەڵکو یەکن، ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کـە - ئەو رەگی‌دا هەر ئەو ووشانەن کە لە گفتوگۆی رۆژانەدا بەکاریان‌دێنین وە لەبەر پێویستی بوون بە چـــاوگ بەیاریدەی یەکێك لەنیشانەکانی چاوگ بەڵام ئەم نیشانانە نەیان توانیوە واتایان پێ‌ببەخشن یان بۆ سەر زمان قورسەو نایێت بەو شێوەیە بەکاربیت‌و وەك فرمان بگۆررێتەوە بۆ کاتەکان- بۆیە ئەم پێشگرو پاشگری ( وە )یە بۆ ئەم مەبەستە پاش یان پێشی

چاوگەکە دەگرن و دەبن بە بەشێك لێ ی و لەفرمان جودانابنەوە هیچ کاتێك چونکە بە جودابوونەوەی ئەو چاوگە دەچێتە ریزی چاوگی بێ‌وانا. نموونە بۆ ئەمە زۆرە وەك :-

روت- رووتان- رووتانەوە- داررووتان

لال- لالان- لال‌نەوە

کزە- کزان- کزانەوە

شاخ- شاخان- هەڵشاخان

چزە- کزە چزان- کزان- کزانەوە

٤ - ئەوەی پێویستە لیرەدا بیزانین‌تێکەڵ نەکردنی نـاوی دەنگەسروشتی‌یەکانە، یان بەپێچەوانە ئەو چاوگانەی کە (ئاندن) کردوونی بەتێنەپەڕ - وەك چاوگ و فرمان، کە ئەمانە سروشتی‌یان وایە - بۆیە دەبن بە تێنەپەڕ- ئەمە پێویستە لەم باسە جوادا - بکرێتەوەو بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ئەمانەدا تێکەڵ نەکرێت بە لکو، یان لە کاتی باس کردنی پاشکری، ( ئاندن ) یان‌لە باسی ناوی دەنگە سروشتی‌یەکان، یان کاتی باس‌کردنی فرمانی تێنەپەڕی بنجی‌و دروست‌کراو .

٥ - هەندێك ناوی دەنگ وەك لەم باسەدا چەند نموونەیەکان هیناوەتەوە دەبینین ئەم ناوی دەنگانە تێنەپەڕو تێپەڕیان هەیە پاش کردنیان یان بوونیان بە چاوگ و فرمان ئەم

بەشە ناوە - لەو ناوی دەنگە سروشتیانە جوداده کرێتەوە لەبەر دوو هۆ :- یەك - ئەم بەشە لە بەشی پێشوو تازەترە- واتە پاش پێشکەوتنی کۆمەڵ دەست کردن کە ئیش، بار، دوو هەندێك لەم کارانە سروشتییان وایە کە لە خۆیانەوە روویدەدەن و بەیاریدەش بینەدی. لەهەمان کاتدا سروشتییان وایە کە دەنگیشیان تێداهەبێت یان دەنگ بدەنەوە لەگەڵ کارە کەدا. واتە تازە ترن یەك ، دوو ئەنجامی پێویستی و ئەنجامی کارکردن دروست بوون واتە ناوی دەنگی کارن، سێ ـ خۆیان لە خۆیانەوە یان لە رێگەی بکەرەوە واتە لە هەردوو شێوە بە کاردێن، بەپێچەوانەی نـــاوی دەنگی سروشتی یەکان وەك :- تەقە- تەقین- تەقاندن - بە کەم تینە پەر- دووەم تێپەڕە .

٦ ـ ئەم ناوی دەنگانەی پاشان دروست بوون ئەنجامی کار کردن و بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵ لەبەر ئەوەی نیشانەی کارن لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە نیشانەی دەنگ بۆیە (مجازاً) وەردەگیرێن و بەگوێرەی پێویستی یان بۆ دەنگە کە، یان وەك: کار . بکەرێز وە سەر باس و پەراوێزە کان.

٧ ـ مەرج ، نی یە ئەو چاوگانەی لیرەدا باسیان دەکەین لە هەموو شێوە کـــاندا وەك یەك بن، بە لگو ناوچە تا ناوچە.. شێوە تا شێوە ئەمانە دەگۆڕێن، واتە هەیە لە شێوەیەکدا سەربەخۆیەو وەك هەر چاوگ و فرمانێکی ســـەربە خۆ و

واتادار بەکاردێت لە شێوەکەی تردا وانی‌یە، ئەمەش بێ‌گومان پێویستی بە لێکۆڵینەوەو گەڕانێکی باشە، چونکە بوونی ووشە بەم جۆرە چاوکێ فرمان بێت یان هەر ووشەیەکی تر بێت راستی‌یەکەو هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی شێوەکانو ئەو کاتوزرووفەی دەوری دەدات، هەشە لە هەمان کاتدا لە گشت شێوەکاندا وەك یەکن، هەشە لە شێوەیەکدا بەتەنیا واتادەن لە شێوەکەی تریش هەر بەم جۆرەیە، ئەمەش دووبارە ئەو راستی‌یە دەگەیێنێت کە ئەم شێوانە شێوەی زمانێکنو لەیەك بنچنو کەلێك تایبەتی‌و سروشتی ئەو بنچە پێکەوەوەردەکردن بۆ ئەم مەبەستە بەووردی سەرنجی نموونەکان بدەنەوە.

٨ - لە هەموو زمانێکدا هەروەها لە زمانی کوردی‌دا زۆر جار پیتەکانی ووشەیەك پاش‌و پێش‌دەخرێن لە قسەکردندا بەبێ گۆڕینی واتاو مەبەست‌و بەگوێرەی ناوچەو شێوەکان کە ئەمانە لە لایەکەوە دەبن بە هاومەبەستی یەکدی وەك:- بزرکان - برزکان، بەڵام هەندێك جار بە پاش‌و پێشخستنی پیتەکان دژی مەبەست دروست دەبێت‌و بە پێچەوانەی یەکەم دێت لە واتادا، وەك: پیت- (حرف) تیپ (کۆمەڵ) بە گۆڕینی جێگەی (ب)و (پ). یان بەگۆڕینی پیتی بزوێنی ووشەیەك هاومەبەست دروست دەبێت وەك: هەرا، هاڕە، هوریا، هووڕە، یان:- قاڕە- قیڕە،

قۆڕە، قووڕە هتد بۆ سەرنجدان .

٩ ـ ئەگەر سەرنجی ئەم چاوگ و فرمانانە بدەین کە بەتەنیا بەکارنایێن واتە بەبێ پێشگرو پاشگر نەبێت مەرج نییە ئەو چاوگ و فرمانانە تاقە یەك پێشگر یان پاشگر وەربگرن. بەڵکو بەگوێرەی پێویستیو گونجانە واتە هەیە سەرەڕای پاشگرو پیشگری ( وە ) چەنـد پیشگرێك وەردەگرێت بۆ چەند واتاو مەبەست کەیاندنو بەگوێرەی پێویستی لە گفتوگۆ کردندا بەکاردێت وەك :ـ

کڕووزان- کڕووزانەوە- هەڵکڕووزان .

رووتان- رووتانەوە- داڕووتان .

خوڕین- تێ خوڕین- لێخوڕین .

١٠ ـ لێرەدا هەندێك چاوگ و فرمان دێنە پیش چاو کە لە فرمانی عەرەبییەوە وەرگیراونو چوونەتە چوارچێوەی زمانی کوردییەوەو وەك هەموو چاوگ و فرمانێکی ئەم زمانە بەبێ جیاوازی، نموونەش بۆ ئەمانە نەك تەنیا ئەمانەی ئێرەیە بەڵکو لە شێوەی ژووروودا نموونە زۆرە وە ئێمە ئەمە بەوە لیكدەدەینەوە کە ئەم شێوەیە وەك زمانی فارسی لە جێگەی تواندنەوە خۆی بە گەلێك ووشەی عەرەبی دەوڵەمەندو فراوان کردوودو بە جۆرێك چوونەتە چوارچێوەی زمانەکەوەو بوون بە هی زمانەکەمان هیچ عەرەبیێك بە ئاسانی لەو واشانە ناکات تافیری نەکەیت

یان فێری زمانی کوردیو سروشتی ئەم زمانەو بنکەکانی نەبێت، بەم جۆرەش ووشەی کوردی چۆتە زمانی عەرەبیەوە کە ئەمەش بەڵگەی توانایی ئەم زمانانە دەردەخات واتە شت دەدات و شت وەردەگرێتو لە شوێنی خۆیداو کاتی پێویستی کاردەکەنە سەر یەکتری، بۆ نموونە:- تەمراندن، کەواندن، شەوتاندن، شوبهاندن مەسحاندن هتد . .

١١ - هەندێك ووشەمان لەگەڵ ووشەی زمانەکانی تر بەراورد کردووەو پەیوندیی نێوانیانمان دەرخستووە لە رووالەتو لە ناوەرۆکدا بە بێ ئەوەی بەتەواوی دەری- بخەین ووشەکە سەر بەکام لایە بۆ نموونە:- بریقانەوە لەگەڵ (برقوبریق)ی عەرەبی، هەروەها: خەڵەتاندن هەڵخلەتاندن- هەڵە- غلط، یان قۆرت - قورت - قورتـــان لە کوردیو تورکیدا لەگەڵ نموونەی‌تر چونکە جێگەی باس‌کردن نی‌یەلێرەداو پێویستی‌ی بە باسێکی سەربەخۆو لێکۆڵینەوەیێکی باشە .

١٢ - ئەگەر سەرنجی رەگی فرمـانو چاوگ بدەین دەبینین دەورێکی باڵاو گرنگیان لە دروست‌کردنی دەیەها ووشەو واناو مەبەستی نوێ لەم زمانەدا هەیە کـــە ئەمە خۆی بەتەنیا پێویستە لێی بکۆڵرێتەوەو بەتەواوی مافی بدرێتێ نـــەك پشت گوێ بخرێت وەك پشت گوێ خراوە بۆ

نموونـــه :- بیژین - بیژانەوە- بیژ- بیژنگ = رەگ + پاشگری ( نگ = nig ) ، زانین - زان ـ زانا، زۆرزان، نەزان، دزین ـ ئاودز- دزاودزکەوتن . بڕین - چەرگ‌بڕ- هەناسەبڕکێ کێشان - مووکێش . ئاشێن - دار ئاش، خواستن - دڵخواز، پۆشین - رووپۆش - سەرپۆش- بالاپۆش . هتد . . .

١٣ - هەندێك لەم رەگانە ووشەو واتای نوێیان دروست‌کردووە بە یاریدەی پێشگر یان پاشگر بەلام هەندێك لەم پاشگرانە دەخەینە پێش چاو بۆ سەرنجدان چونکە لەو پاشگرانەن کەس بەلایاندا تێنەپەڕیوە، باسی نەکردوون بەو شێوەیەی پێویستە، کە ئەمە پشت گوێ خستنی زمانەکە دەگرێتەوە نەك تەنیا ئەم بەشانە بۆ نموونە :- پاشگری : نگ = بیژنگ، تە- پۆشتە، رەقیتە، پاشگری نە پاچینە، توولێنە، پاشگری ( ئان - An ) : باران، پاشگری ك ( IK ) درك، پاشگری ( ە - e ) راست - راستە، پاشگری کە- Ge - بڕگە، پاشگری ( ن - ێن )- لە ناوی یاریدا، پاشگری کێ - ke - چاوشارکێ ، پاشگری ( وو - U ) لەگەڵ ناودا پێش - پێشوو .

١٤ - پەیوەندیی نێوانی ئەم پاشگرەو هەمان پاشگرمان دەرخستووە کە لە زمانێکی تردا هەیە بەلام بە شێوەیێکی کورت چونکە لێرەدا جێگەی باس نییەو نەشمان ویستووە بـــە بێ

سەربخراکێشان بەسەریاندا تێپەڕین، هەر چەندە لەمە زیاترمان بۆ قوتابیەکان روون کردۆتەوە بۆیە ئەمە بە بەس دەزانین لێرەدا بۆ نموونە :ـ

پرسش ـ کوردی ـ کەردش ـ فارسی ـ کیالمش ـ تورکی . پاشکری (ش ـ، پاشگری (چە)ـ لە کوردیو تورکیدا هەروەها ووشەی ـ پارچەو پەرچە لەم دوو زمانەداو هتد..

١٥ ـ هەندێك لەم رەگی چاوگانە لە هەمان شێوەدا پیتەکانیان گۆڕراوە بۆ مەبەستێکی تر بەلام نیزیك بە هەمان مەبەست کە یەکدەگرنەوە لە بنجدا ـ بگەڕێرەوە بۆ باس و پەراوێزەکان .

١٦ ـ هەروەها چاوگ هەن یەکن بەلام تەنیا جیاوازییان لە نیشانەی چاوگدایە نەك لە رەگ، دووبارە لەبەر هەمان مەبەستی سەرەوە یان دروست کردنی هاومەبەست بۆ هەمان ووشە بۆ نموونە: بێژین ـ بێژانەوە رەگەکانیان ـ بێژ ـ . بگەڕێرەوە بۆ باسەکە .

١٧ ـ بەشێك لەو چاوگانە بۆمان دەردەخەن کە نیشانەی چاوگ مەرجە ووشە بکات بە چاوگ بەلام مەرج نییە واتای پێ ببەخشێت بۆ نموونە : ـ رووت ـ رووتان، لال ـ لالان، کڕووزان هتد . . .

١٨ ـ ئەگەر سەرنجی هەندێك لەم نموونانە بدەین دەبینین هەر کۆمەڵێك لەمانە یەکدەگرنەوەو دەچنە شێوەی لق و پۆپی

ووشەیەك یان واتاییك کە بەلای ئێمەوە ئەمەهەر ئەوە نییە لێرەدا باسکراون، یان هەر بەوەندە بوەستین بەڵکو تەنیا لەبەر سەرنجراکێشانی خوێنەر ئەمەندمان خستە پێش‌چاو، بۆ نموونە : ـ سووتان، پرووکان، پرووزان، یان: داڕووتان، رووتانەوە. پرووسقان، قۆستنەوە، لێستنەوە. خواردن خواردنەوە. پێکەنین، خەنین، تریقانەوە قاقاوپێکەنین هتد . . .

١٩ ـ هەندێك لەم ووشانە دوو واتاو مەبەستیان هەیە وەك : ـ پرووشکە ـ کە ناوی جۆرە رووناکییەکەو بۆ جۆرە ئازارێکیش بەکاردێت . بڕوانە پەراوێز ژمارە : ٢٢: هەروەها خورە، چۆرە هتد . .

٢٠ ـ هەر لەم باسەدا ناوی هەندێك یاریمان کەوتە بەر چاو لەگەڵ چۆنیەتی پێکهاتنی ، بۆیە هاتینە سەری. هەندێك رەگی چاوگ‌و فرمان لەگەڵ هەندێك پاشکر هاوبەشن لە دروست کردنی ناوی ئەم یاریانە بۆ نموونە : شاردن ـ شار ـ رەگی چاوگ‌و فرمان ، چاو ( ناو ) + شار : ( رەگ ) + پاشکری ( کێ ) = چاو شارکێ . هەڵپەڕ ـ کێ هەڵ + پەڕ ( رەگی چاوگ‌و فرمانی پەڕین ) + کێ . بگەڕێرەوە بۆ باس‌و پەراوێزەکان .

٢١ ـ ئەگەر سەرنجی نموونەکانی ئەم باسە بدەین دەبینین بەشێکیان کە وەك : چاوگ‌و فرمانی بێ‌واتا دێتە بەرچاو لەبەر

ئەوەیە کە بەبێ پێشگر یان پاشگر بەکارنایێن ، بەڵام پاش وەرگرتنی رەگەکانیان دەبینین لە رووالەتو واتادا واتای هەندێك ناو دەگرنەوە بە جۆرێکی دی دەڵێین کە ناوو ئاوەڵناو هەن رووالەتو واتایان وەك رووالەتو واتای ئەو رەگانەیە ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کە ئەم ناوو ئاوەڵناوانە بوون بە چاوگ‌و فرمان ئەنجامی پێویستی‌و لە کاتی پێویستیدا ، بە یاریدەی نیشانەی چاوگ یان نوونی چاوگ ، بەڵام ئەم نیشانەیە ئەی‌توانیوە ئەو واتایانە وەك خۆیان بپارێزێت یان لە قسەکردندا مرۆڤ بۆی نایێت وەك چاوگ‌و فرمانە سادەکانی تر بەکاریان بهێنێت ، بۆیە پێشگرو پاشگر ئەم دەورە گرنگە دەنوێنن ، ئەمەش دەخرێتە سەر دەورە گرنگەکانی پێشگرو پاشگری ئەم زمانەو زمانە هاوبەشەکان لەمەدا ، سەرەڕای دەرخستنی رێگەی پەرەسەندن‌و ئەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر ووشەدا دێت بۆ کەیاندنی ئەو مەبەستە تازانەی روودەدەن ئەنجامی پێشکەوتنی کۆمەڵ ، هەروەها بەرای ئێمە ئەمانە تارادە۔یەك تازەن چونکە رەگەکانیان بەبێ دەستکاری‌و گۆڕران لە فۆرم‌و واتادا ماونەتەوە . بە ووردی سەرنجی ئەم جۆرە فرمانانە بدەن کە لەم باسەدایە بۆ روون‌بوونەوەی ئەم بیروڕایە .

## المصادر التي فقدت معانيها واستقلاليتها في اللغة الكردية . أسباب ذلك وكيفية استعمالها في هذه اللغة

يتضمن هذا البحث قائمة بالمصادر التي منها ما فقدت معانيها واستقلاليتها بمرور الزمن ، ومنها ما تكوّنت دون أن تملك استقلالية تلك المصادر ، وإنما تتداول على الالسن بمساعدة الأفيكسات لاسباب حاولنا ذكرها وتوضيحها وتقريبها الى الاذهان وتبيان سبب اختفاء البعض منها وبقاء البعض الآخر مع طرق استعمالها اليوم اضافة الى ذكر اصولها وتطوّرها وتوالدها وتجددها ومعانيها ومفاهيمها المختلفة مدعمة بالامثلة والقرائن البيّنة .

كما وان قيمة هذا البحث العلمية تظهر في الشروح والتوضيحات والتعليقات والملاحظات اللغوية والكراماتيكية مع مقارنتها بلغات اخرى من حيث التشابه والاختلاف والمذكورة في حواشي البحث والتي هي بحد ذاتها جديره بالدراسة والتحقيق وتخصيص مقالاتٍ أو دراساتٍ خاصةٍ بها .

# سەرچاوەکان :- ( المصادر )


١ - دەستووری زمانی کوردی - توفیق وهبی - بەغدا ١٩٢٩ .

٢ - اللغة والمجتمع - الدکتور علي عبد الواحد وافی - القاهرة - ١٩٧١ .

٣ - علم اللغة الدکتور علي عبد الواحد وافی ط القاهرة ١٩٦٢ .

٤ - اصوات واشارات - دراسة في علم اللغـــة - أ - کوندراتوف - ١٩٦٩ .
عن الانکلیزیة - ترجمة - ادور یوحنا .

٥ - دوکتۆر - قەنات کوردۆییێف - دەستووری زمانی کوردی - ( بە زمانی ( رووسی ) لینینگراد - ١٩٥٧

٦ - اللغة بین الفرد والمجتمع - تالیف - اوتو جسبرسن ترجمة الدکتور عبد الرحمان محمد ایوب - مصر - ١٩٥٤ .

*Mankind Nation and Individual From ALinguistic Point Ob View . 1923 .*
*By*
*Otto Jespersen*

٧ - *A - S. MARMARjI . O . P .. LA*
*Lexicographie Arabe A La Lumiere*
*Du Bilitte Ralisme Et De La Philo-*
*logie Seme Tique . Jerusalem. 1937* بالعربية

٨ - ی . ی . سۆکەرمان . هەندێك تێبینی دەربارەی دەستوری زمانی کوردی مۆسکۆ ١٩٦٢ بە زمانی رووسی .

٩ - جرجي زيدان - اللغة العربية كائن حي - مراجعة الدكتور مراد كامل .

١٠ - ئەکادێمیك - بی . بی . میشانینۆف . فرمان - الفعل - مۆسکۆ - لینینگراد - ١٩٤٩ . بە زمانی رووسی .

تێبینی : بێگومان ئەم کتێبە هەڵەی چاپی تێدایە تکایە ئاگاداری بین و راستی بکەنەوە لەگەڵ لێبوردن .

---

بۆ ئاگاداری : تکالە خوێنەری بەرێز دەکەین کە ئاگاداری پیتی ( ێ )ی کراوەبن کە لە هەندێك شوێن نیشانەی حەوتی لەسەر نی یە ، کە بەهۆی لەبیرچوونەوە نی یە بەڵکو لەبەر تەواو بوونی بوو لە چاپخانەکە ، وەبۆ ئەوەی کتێبەکە دوا نەکەوێت بەم جۆرە هێشتمانەوە .

دانەر

# THE INFINITIVES
# WHICH LOST THEIR MEENING
## In the Kurdish Languege
## The Reasons and their usage
## In this Language

By : Dr . Nasreen Fakhri
Dept : Kurdish Language
College of Arts

Baghdad - 1973

---

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٨٦٦ لسنة ١٩٧٣
٢٨ - ١٠٠٠ - ٣ / ١٠ / ١٩٧٣
ثمن النسخة ٣٥٠ فلس
مطبعة الآداب ـ النجف الأشرف

ساعد المجمع العلمي الكردي على طبعه

المصادر التي فقدت معانيها

سبب ذلك وطرق استعمالها في

اللغة الكردية

تأليف


الدكتورة نسرين فخري

مدرسة اللغة وقواعد اللغة الكردية

في جامعة بغداد

والعضوة الموازرة للمجمع العلمي الكردي



بغداد

١٣٩٣ هـ — ١٩٧٣ م

نرخى ( ٣٥٠ ) فلسه

---

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٨٦٦ لسنة ١٩٧٣

٢٨ ـ ١٠٠٠ - ٣ / ١٠ / ١٩٧٣

ثمن النسخة ٣٥٠ فلس

مطبعة الآداب ـ النجف الأشرف